ئەدیبان




# پیرەمێرد

# کەمانچەژەن

کاکەی فەلاح پێشەکیی بۆ نووسیوە

# کەمانچەژەن

## هانس کریستیان ئەندرسن





پیرەمێرد وەریگێڕاوە

کاکەی فەلاح پێشەکیی بۆ نووسیوە



ADIBAN

ناوەندی ڕۆشنبیری ئەدیبان

بەڕێوەبەری گشتی: ئارامی مەلا محەمەد

**ناونیشان:** سلێمانی، شەقامی ئیبراهیم پاشا، فولکەی گۆزەکان، نزیک ناوەندی ڕۆژهەلاتی کوڕان.

**پەیوەندی:** 07701974656 - 07501590032 - 07731974646 - 07501696369.

**Email:** bookadiban@gmail.com

**Facebook:** https://www.facebook.com/eadiban/

## ناسنامەی کتێب

ناونیشان: کەمانچەژەن.

نووسەر: هانس کریستیان ئەندرسن.

وەرگێڕانی: پیرەمێرد.

پێداچوونەوەی: عیسا عوسمان.

بابەت: ئەدەبیاتی ئەڵمانی – سەدەی 19م.

دیزاین: عیسا عوسمان.

پەخشانگە: ناوەندی ڕۆشنبیری ئەدیبان.

ساڵی چاپ: 2020میلادی.

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم.

تیراژ: 1000 دانەی لێ چاپکراوە.

له بەڕێوەبەرایەتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (2686) ساڵی (2019) پێی دراوە، ئەم کتێبە لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی ڕۆشنبیری ئەدیبانە،

## پێشەکیی کاکەی فەلاح

خوێنەری خۆشەویست

ئەم چیرۆکەی کە لە بەردەستتدایە، یەکێکە لە بەرهەمە ئەدەبییە بەنرخەکانی پیرەمێردی نەمر کە لە کۆتایی سییەکان و سەرەتای چلەکاندا، بە شێوەی چاپکراوی هەشت لاپەڕەیی، لە تورکییەوە دەیکرد بە کوردی و لە چاپخانەی ژیانی سلێمانی چاپ و بڵاوی دەکردەوە. تا لە ئەنجامدا کردی بە دوو بەرگی کتێبێک بە ناوی (کەمانچەژەن) و، پێشکەشی کتێبخانەی کوردی کرد.

پیرەمێرد لە سەرەتای بەرگی یەکەمدا دەڵێت: «ئەمە هونەرمەندێکی ئەڵمانی نووسیویەتی، تۆفیق بەگی میر ئالاش کە مەشهوورە بە تۆفیق بەگی کەرکووکی و کوردە، وەری‌گێڕاوەتە سەر تورکی.» بەمەدا وا دەردەکەوێت کە وەرگێڕە تورکەکە ناوی ئەسڵی نووسەری نەنووسیبێ، یان پیرەمێردی ڕەحمەتی کە وەری گێڕاوەتە سەر کوردی، ناوی فەرامۆش کردووە. هەرچۆنێک بێت هەتا ئەمڕۆ، هەموو ئەو کەسانەی کە وەختی خۆی چیرۆکی کەمانچەژەنی وەرگێڕراوی پیرەمێردیان خوێندۆتەوە و، مەستی بەسەرهات و ناوەڕۆکی ئەو چیرۆکەن و شەیدای ئەو زمانە تەڕ و پاراو و شیرینە کوردییەن کە لە دەسەڵاتی ئەدەبیی پیرەمێرددا هەبووە، زۆر تاسەی ئەوەیان کردووە بزانن دانەری ئەم چیرۆکە کێیە. تەنانەت ئەو نووسەر و ڕۆشنبیرانەش کە ڕێیان کەوتۆتە ئەڵمانیا و دەرفەتی مانەوە و گەڕانی کتێبخانەکانیان

دەست کەوتووە، ئەوەندەی بۆیان کرابێت سۆراخی ناوی دانەری *کەمانچەژەن*یان کردووە و، یەکێک لەو ڕۆشنبیرانەش کە ئەوەندەی من ئاگام لێیە و لە نزیکەوە ئاگادارم، دکتۆر کەمال فوئادە کە ساڵانێکی دووروودرێژی لە ئەڵمانیا بۆ خوێندن بەسەربردووە و، خوێندنی باڵای لە زمانی کوردیشدا هەر لەوێ تەواو کردووە، زۆر بە خولیاوە گەڕاوە بە شوێن ناوی دانەری ئەم چیرۆکە و دەستکەوتنی چیرۆکە ئەڵمانییەکە، بۆ ئەم مەبەستەش تەواو خۆی شەکەت و ماندوو کردووە و بەداخەوە کە نەگەیشتۆتە هیچ ئەنجامێکی دروست.

هەر بەو خولیایەوە دکتۆر فوئاد لە ساڵانی حەفتادا کە لە چاپخانەکەی مندا سەرپەرشتی چاپکردنی *ژانی گەلی* دەکرد، *کەمانچەژەن*یشی نووسیبۆوە و دەیویست چاپی بکات، بەڵام ڕۆژگار مۆڵەتی نەدا و نەیتوانی ئەم ئەرکە بەجێ بگەیەنێت.

نەزانینی ناوی دانەری ئەم چیرۆکە شیرینە هەروا بە گرێکوێرەیی لەناو ڕۆشنبیرانی سەردەمی پیرەمێرد و ئەم سەردەمەدا مایەوە، هەتا بە ڕێکەوت دکتۆر عەلی کەریم عەلی، کە خەڵکی سلێمانییە و ئیختصاصی لە جوگرافیادا هێناوە و لە زانکۆی بەسرە مامۆستایە و یەکێکە لە ڕۆشنبیرە ئەدەبدۆست و سەرمەستەکانی چیرۆکی *کەمانچەژەن*، بە ڕێکەوت لە دەرەوە کتێبێکی دەستدەکەوێت، دەڕوانێت کتومت *کەمانچەژەنە* و نووسەرێکی بەناوبانگی دانیمارکی کە ناوی *هانز کریستیان ئاندرسنە*[1] دایناوە. ئەو نووسەرە بەهرە و

[1] چیرۆکنووسێکی گەورەی دانیمارکییە. ساڵی ١٨٠٥ لە دایك بووە و ساڵی ١٨٧٥ کۆچی دوایی کردووە. ئەم زانیاریانە لە ڕێگەی

دەستێکی باڵای لە نووسینی ئەدەبی منداڵاندا هەیە و بەرهەمێکی ئێجگار زۆری ئەدەبی هەیە و بۆ زۆرێک لە زمانە زیندووەکانی جیهان وەرگێڕراون و ناوبانگێکی بەرزی جیهانیی هەیە.

ئەمە وا... لێرەشدا نامەوێ باسی بەهرە و دەسەڵاتی ئەو کوریدزانییەی پیرەمێرد بکەم، چونکە توانای ئەو لە زانینی زمان و وشە و دەربڕینی کوردیی تەواو ڕەسەن و خۆماڵی، نەک هەر شتێکی شاراوە و نادیار نییە، بەڵکوو وەک ڕۆژی دەمگەل وایە.

من لە نووسینەوە و ئامادەکردنی ئەم چیرۆکەدا بۆ چاپ، هیچ دەستکارییەکم نەکردووە، ئەوە نەبێت هەندێ وشە کە بێگانەن بە زمانی کوردی و لە کاروانی پێشکەوتن و گۆڕینی زمانی ئەدەبیی ئەم سەردەمەی کورددا بەجێ ماون، وشە و دەربڕینی باوی ئێستەم خستۆتە جێگەیان و لە کۆتاییشدا وەک ئەمانەتێکی ئەدەبی بە نموونەی لیستەیەک دەیاننووسمەوە و دەیانخەمە بەرچاو. جگە لەوەش دەستکاریی ڕێنووسەکەیم کردووە و شێوەی ڕێنووسی ئەو سەردەمەم خستۆتە سەر شێوەی ڕێنووسی ئێستەی زمانی کوردیمان. چونکە خوێنەری ئەمڕۆ، بیەوێ و نەیەوێ، وەک پێویست ناتوانێت چێژ لە بەرهەمە نووسراوەکانی شێوەی ڕێنووسی دوێنێ ببینێ و تینوێتی خۆی پێ بشکێنێ.

---

نووسەری هاوڕێم تەها بابانەوە بە من گەیشتوون و زۆر سوپاسی هەردووکیان دەکەم.

ئەوەی کە پاڵی پێوەنام بۆ جاری دووەم ئەم چیرۆکە بەرەورووی کتێبخانەی کوردی بکەمەوە، دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەک کە ئەمانەی خوارەوەن:

یەکەم: بەهرە و دەسەڵاتی ئەو نووسەرە کە توانیویەتی ئەو هەموو گیروگرفت و کێشە و بەرەیە بۆ قارەمانی چیرۆکەکەی خۆی، بە دەستی قارەمانەکە خۆی دروست بکات.

دووەم: مرۆڤ بتوانێ ئەوەندە ساویلکە و خۆشباوەڕ و خەیاڵباز بێت.

سێیەم: تەوژمی شەپۆلەکانی گیانی گاڵتەوگەپ و بابەتی کۆمیدی و پێکەنین.

چوارەم: ئەوەندە بە تینوتاوە کە هەموو شتێک، هەموو پەستییەک ڕادەماڵێ و بە دانسقە دانەی ماوە و زۆرێک لە ڕۆشنبیران و خوێنەرانی ئێستەمان، بە تایبەتی لاوەکان، لێی بێبەشن.

پێنجەم: هەموو ئەمانە و، لەمانەش زیاتر، ئەو بەهرە و دەسەڵاتی زمانزانینەی پیرەمێرد، بۆ ئێمەی کورد مایەی سەربەرزی و شانازیی شیرینی زمانەکەمانە. دەتوانم بە دڵنیاییەوە بڵێم کەمانچەژەن لە ڕووی وشە و دەربڕین و زاراوە و پەند و قسەی نەستەق و پەندی پێشینان و حیکمەت و بەکارهێنان و داڕشتن و پتەوییەوە، فەرهەنگۆکێکی کوردیی ڕەسەن و تەواو خۆماڵیی ئەوتۆیە، کە بە سەرچاوەیەکی گەش و ڕووناک و پیرۆزی زمانی کوردیمان دابنرێت.

پیرەمێردی نەمر، لە پاڵ شیعر و ڕۆژنامەگەری و کوردایەتی و زانستدا، بە وەرگێڕانی *کەمانچەژەن* بەو شێوە شیرینە، لەم مەیدانەشدا هەر پیرەمێرد بووە و هەر پیرەمێرد دەبێ.

کاکەی فەلاح

سلێمانی ١٩٧٩

# پێشەکیی پیرەمێرد

هێشتا لە ئەستەنبووڵ بووم، ڕۆژێ ئەو منداڵانەی ڕۆژمانە ئەفرۆشن، بە هەموو کۆڵاندا ڕایان ئەکرد و ئەیانقیژاند (چیقدای چیقدی چاڵغیچی)، فۆڕمەیەک کە هەشت لاپەڕە بوو لە ڕۆمانی سەرگوزەشتەی چاڵغیچی، کە ئێمە تارژەنی پێ ئەڵێین دەرچووبوو و ئەیانفرۆشت. یەکێکم کڕی، شەو خوێندمەوە و زۆر خۆش بوو، ئینجا دانیشتین و بە کۆمەڵ خوێندمانەوە، ئەمەندە خۆش بوو لە دڵماندا بوو بە گرێ ئاخۆ سبەینێ فۆڕمەکەی تری دەردەچێ؟ بەیانییەکەی فۆڕمەکەی تری دەرچوو و کڕیمان، شەو هەموو کۆبووینەوە و یەکێک ئەیخوێندەوە. ئەمەندە پێی پێکەنین هەر مەپرسە... ئەم کتێبەم لە بیر مابوو، تا پێرار یادی بەخێر «عەلی دایی» کە کاتبی خەزێنە بوو، لیستەی کتێبی فرۆشتنی کەرکووکی پێ نیشان دام و «چاڵغیچی» تیابوو. زۆرم لا خۆش بوو و کڕیم. شەوانی زستان بە کوردی ئەمانخوێندەوە، منداڵ و مەزم بە چەشنێ دڵیان دایە کە لێی تێر نەدەبوون... ناهەقیان نەبوو، ڕۆمانەکە زۆر خۆش بوو و لە ئەورووپادا تەنها «پول دەقوق» بەناوبانگە بە حیکایەتی گاڵتەوگەپ و لەناو تورکیشدا «حسێن ڕەحیمی» لەم چەشنە گەپانەدا پول دەقوقیشی تێپەڕاندووە، بەڵام ئەم ڕۆمانە لە هەموویان ئاساری خۆش و بەنرخترە، هیچ پەردە بیرونانەی تیا نییە و سەراپا پێکەنینێکی لەسەرخۆ و ئادابە.

ئەمە هونەرمەندێکی ئەڵمانی نووسیویەتی، تۆفیق بەگی میر ئالآش کە بە تۆفیق بەگی کەرکووکی بەناوبانگە و کوردە، وەری گێڕاوەتە سەر تورکی، بەڵام تورکییەکەی ئەم لە ئەڵمانییەکەی شیرینترە. چەنێک ئەمویست منیش بیکەم بە کوردی، زاتەن ئەو تۆفیقەی خوشکەزام کە کردوویە بە تورکی خەریکی بوو. بە خەریتەزانی هەندێکیشی تەرجەمە کردووە، بەڵام ئەشکال و ئەشغال مەیدانی نەدا، ناچار وا خۆم دەستم پێکرد، ئێمە دوو تۆفیق، تەوفیقیش لە خوا.

پیرەمێرد

## پێشەکیی چاپی ناوەندی ڕۆشنبیریی ئەدیبان

نازانم لە کێم بیستبوو، بەڵام دڵنیایان کردمەوە لەوەی کە تەواوی کارە ڕۆژنامەوانییەکانی فەیلەسووفی کورد، حاجی تۆفیق هەمزە ئاغا «پیرەمێرد» لە لایەن بنکەی ژینەوە لە کۆمپیوتەردا ئەرشیف کراوە. منیش بڕیارم دا سەردانی بنکەی ژین بکەم، چونکە خاوەنی دەزگایەک بووم کە چوار گۆڤاری بە شێوەیەکی فەرمی لە کوردستان بڵاو دەکردەوە. بە پێویستم زانی ئەزموونێک لە کارە ڕۆژنامەوانییەکانی حاجی تۆفیق وەرگرم، چونکە ئەو شارەزایی و زانستێکی باشی لە ئەستەنبوڵ پەیدا کردبوو و دواتر هێنابوویەوە کوردستان و ساڵانێکی زۆر بەر لە ئێمە خزمەتی خەڵکی پێ کردبوو. چوومە خزمەتی مامۆستا ڕەفیق ساڵح و داوام لێکرد لەبەرگیراوەیەک لە سەرجەم ژمارەکانی ڕۆژنامەی ژین و ژیانم پێ بدات، کە حاجی تۆفیق کاری تیا کردبوون. منیش بەوپەڕی سوپاس و پێزانینەوە سەرجەم ژمارەکانی ژین و ژیانم وەرگرت کە کاک ڕەفیق بە سیدی پێی دابووم و منیش بۆ ئەزموونوەرگرتن لە کاری ڕۆژنامەوانیم، دەستم کرد بە خوێندنەوەی کارەکانی حاجی تۆفیق. حاجی تۆفیق لەناو کارە ڕۆژنامەوانییەکانیدا، کتێبەکانی زنجیرە زنجیرە بڵاوکردبوونەوە، لەو کارانەی کە من بەرچاوم کەوتن لە ڕۆژنامەکەیدا، شیعرەکانی وەلی دێوانە، پەندەکانی بەڕێزیان، هەروەها کتێبی کەمانچەژەن بوو کە بە دوو ژمارە دایگرتبوو و چەندین بەرهەمی تریش. جا لەبەر ئەوەی کە لە هەمان کاتدا دەزگای بڵاوکردنەوەی کتێبیشم هەبوو، بڕیارم دا کە سەرجەم ئەو کتێبانەی حاجی تۆفیق

خۆی کە بە زنجیرە بڵاوی کردبوونەوە، کاری کۆمپیوتەری نوێیان لەسەر بکەمەوە و بە زمانەوانیی و ڕێنووسی نوێوە، چاپ و بڵاویان بکەمەوە، بۆ ئەوەی ئەم نەوەی ئێستەش سوودمەند بن لە ئەزموون و کارە ناوەزەکانی حاجی تۆفیق.
بەر لەوەی باسی گرنگی بڵاوکردنەوەی کەمانچەژەنتان بۆ بکەم، حەز دەکەم ئاماژە بەوەش بدەم کە بیستبووم کاتی خۆی شاعیری گەورەی کورد، کاکەی فەلاح، لە چاپخانەکەی خۆیدا دەستنووسێکی دکتۆر (دکتۆر کەمال فوئاد)ی لابووە و چاپی کردووە. هەر بۆیە ڕۆیشتم و بەدوای چاپێکی کەمانچەژەندا گەڕام، کە کاک ڕێبواری چاپخانەی شڤان چاپی کردبوو و مۆڵەتی لە کچەزاکانی پیرەمێرد وەرگرتبوو، تا بڵێی چاپێکی جوان و ناوازە بوو، تەنها هەندێ تێبینیم لەسەر ڕێنووسەکەی هەبوو. بۆ دڵنیابوونەوەم جارێکی تر چاپەکەی چاپخانەی شڤانم بەراوردکردەوە بە ڕۆژنامەکەی پیرەمێرد خۆی، بۆم ڕوونبووەوە کە چاپەکەی کاکەی فەلاح باشترین چاپی کەمانچەژەن بووە، بۆیە بڕیارم دا کە ئەوەی کاکەی فەلاح بە ڕێنوسێکی نوێوە چاپ بکەمەوە. سەردانی یادگارییە جوانەکەی کاکەی فەلاحم لە سلێمانی کرد کە چاپخانەکەی بوو، هێشتا مابوو و کاریان تێیدا دەکرد، کوڕەکانیم لە پێشەوە بینیی و لەوێ مۆڵەتی چاپکردنەوەی کەمانچەژەنم لێ وەرگرتن، خودا هەڵناگرێت کاکەی فەلاح کوردگوتەنی وەجاخی ڕۆشنە و بە ڕاستی کۆمەڵێک کوڕی ڕۆشنبیر و بەڕێزی پەروەردەکردوون. بە ڕێنووسێکی جوانی تازەی کوردی و دیزاینێکی ناوازە ئەم بەرهەمە وەرگێڕدراوەی حاجی تۆفیقم چاپ کردەوە و بە بێ هیچ سوود و زیادە خستنەسەرێک،

لەسەر ئەرکی خۆم چاپم کرد و سەرلەنوێ ژمارەی سپاردنم بۆ وەرگرتەوە و بە تێچووی خۆی بە کتێبفرۆشەکانم فرۆشتەوە، بۆ ئەوەی بە نرخێکی هەرزان بکەوێتە بەر دیدی خوێنەران. پێم باش بوو کە ژیان و بەرهەمەکانی هانس کریستیان، نووسەری ڕاستەقینەی بەرهەمەکە و ژیانی پیرەمێرد ، ژیانی کاکەی فەلاحیش بۆ کتێبەکە زیاد بکەم، بۆ ئەوەی خوێنەر زیاتر پێیان ئاشنا بێت. وێنەیەکی بەرگی کەمانچەژەنم بە ئەڵمانی دەستکەوت کە ئەویشم داناوە بۆ ئەوەی خەڵکی بزانن کە سەرچاوەی سەرەکی ئەم ڕۆمانە چییە. ماوەتەوە بڵێم کە ئەم ڕۆمانە دوای خوێندنەوەی تەواو کاریگەریی لەسەر دانام، بەر لە هەمووشتێک دەبێ وەسفی زمانی جوان و شیرینی پیرەمێرد بکەم کە ئەم کتێبەی پێ وەرگێڕاوە، چونکە پیرەمێرد دەکرێ ئێمە وەک فەرهەنگێکی کوردیش تەماشای بکەین نەک تەنها نووسەر و وەرگێڕێک. گەنجینەی دەوڵەمەندی زمانی پیرەمێرد و لێهاتووی لە زمانە بیانییەکاندا، وایکرد کە ئەم بەرهەمە هەر زوو بچێتە نێو خوێنەری کورد و دەنگدانەوەیەکی باشی هەبێت. سەبارەت بە چیرۆکی کتێبەکەش، چیرۆکێکی ئاشقانەیە، باس لە کوڕێژگەیەکی دەستکورت دەکات کە لە خێزانێکی هەژاردا گەورە بووە، ڕۆژێک باوکی دەری دەکات و ئەمیش بە ناچاری ڕێی نادیار و سەرگەردانیی خۆی دەگرێتە بەر. ئەلفرێد مۆلەر کەسایەتیی سەرەکی ناو ڕۆمانەکەیە، ڕۆژێک تووش گالیسکەیەک دەبێ و هەر لەوێوە ئاشقی خانمێکی شۆخ دەبێ، بە جۆرێک کە ئەلفرێد مۆلەر لە پێناویدا بەرگەی هەموو ئاستەنگی و نەهامەتییەکانی ژیان دەگرێت. تووشی گەلێک

دەردیسەری و کێشە دەبێت و نامەوێ لێرەدا هیچ سەرەداوێک بۆ خوێنەر ئاشکرا بکەم و لە چێژی خوێندنەوەکەی بکەم. بەڵام ئەوەندە دەڵێم کە چیرۆکێکی تەواو جوان و بەچێژە، فێری گەلێک شتی کردم و ئیدی با زمانی شیرین و پاراوی پیرەمێردیش لە لایەکی دیکەوە بوەستێت، کە هەست ناکەی ئەم کتێبە بە زمانێکی دیکە نووسراوە، بەڵکوو هەر دەڵێی بە کوردی نووسراوە و ڕووداوەکانیش هەر لەم کوردستانەی خۆمان ڕوو دەدەن! ڕەنگە ڕێگەکان بۆ مرۆڤ سەخت بن، بەڵام دواجار ئەوە خۆشەویستیی ڕاستەقینەیە کە وا دەکات ئەو مرۆڤە تا کۆتایی ئەو ڕێیە بەر نەدا کە گرتوویەتییە بەر. هەڵبەت لەم نێوەندەشدا گەلێک شتی دیکە هەن کە هاندەرن و تەواوکەری ڕێگەی کەسەکەن، بۆ نموونە دۆستێکی باش، دۆستێک کە تێدەگا و هاوخەمە و هاوبەشی خەم و ئازارەکانە. ئەلفرێد مۆلەریش لە نیوەی ڕێگەکەیدا، لە گەرمەی کێشە و ئازارەکانیدا، دۆستێکی لەم جۆرە دەدۆزێتەوە کە هاندەر و هاوکاری دەبێت تا کۆتایی. هاوکات دەبێ بڵێم کە چیرۆکی ڕۆمانەکە پڕە لە بەسەرهاتی خۆش و پێکەنیناوی کە وا دەکەن خوێنەر لە خوێندنەوەی وەڕەس نەبێت.

ئارامی مەلا محەمەد

٢٠١٨/٨/١٦

# فەسڵی یەکەم

## بەسەرهاتی ئەلفرێد مۆلەری کەمانچەژەن

لە «ئەیالەت»ی باویرا، لە دێیەکی بچووک لە دایک بووم. باوکم جووتێ گای هەبوو و فەلاحەتی پێوە دەکردن. داخی ئەوەم لە دڵایە کە دایکی خۆمم نەدیوە، بەسەر منەوە چووە. باوکم هیچ ناوی لای من نەدەهێنا، بەڵام وەک خەڵکوخوا بۆیان دەگێڕامەوە، ژنەلادێییەکی باش بووە. باوکیشم لەوانە نەبوو خوو بداتە منداڵ، تەپاڵەی گاکانی لە منداڵ خۆشتر دەویست. ئەوەندەی ئەو منی نەدەویست، منیش ئەوەندە لە شاخی گاکانی ئەو بێزار بووم. بە ڕۆژ لێی دەگەڕام تا ئەو دەچوو بۆ جووت، لەگەڵ دوور دەکەوتەوە، لە خوار دێوە داربەڕوویەکی لێبوو، دەچووم لە سێبەری ئەودا ڕادەکشام. لە گڵ وەک سەرین جێیەکم بەرز دەکردەوە و سەرم دەکردە سەری، یا لقەکانی دارەکەم دەژماردن، یان ئەو مێشانەی کە پێمەوە دەنیشتنەوە. ڕاهاتبووم، دەمزانی چەند لقی پێوەیە، بەڵام حسابی مێشم پێ ڕانەدەگیرا، تەرحم نەدەزانی.

ئێواران دەهاتمەوە و گاجووتەکانم بۆ باوکم ئاو دەدان، خۆشم سا شلەی ساوەرێ، هەنجیرە وشکێ، قنچکە باسوورمەیەک، نانەڕەقەیەک، هەرچیم دەست بکەوتایە ئەمخوارد و شوکری خوام بە ناچاری دەکرد و لێی دەنووستم.

هەندێ جار دەچوومە کڵێسا، قەشەیەکی زۆر چاکمان هەبوو. خوا کاری ڕاست بێنێ فێری خوێندن و نووسینی کردم، ژنەکەیشی کەمانی چاکی لێئەدا، خستمییە سەر خولیای کەمانچەژەنی. خوایش وای بۆ کردبووم لە باتی هەموو هونەرێک، کەمان چاک لێ بدەم و دەنگیشم خۆش بوو. خۆیشم لە خۆم نەگەیبووم کە لەم سنعەتە پەسەندەدا ئەمەندە بەکارم. بەم جۆرە گەیشتمە هەژدە ساڵی و بە بێ کار و بێکارەیی ڕام بوارد. ڕۆژێکیان باوکم لێم تووڕە بوو، دەری کردم و سوێندی خوارد جارێکی تر پێت نایەتەوە بە ماڵما، زانیم بە ڕاستیەتی. تووڕەکەیەکی پینەکراومان هەبوو، باوکم تووی تیا دەبردە سەر جووت، پڕم کرد لە نانەڕەقەی کۆن و هەندێ هەنجیرەوشکە و لەتکە هەرمێ و قنچکە باسوورمە و کەمانەکەیشم کە پوول پوول لە باوکم دزیبوو و کەمانم پێ کڕی. هەموو ئەمانەم لە خۆم بار کرد و یەڵڵا و یا ڕۆح ئەڵڵا لە ماڵ هاتمە دەرێ، ئاوڕم نەدایەوە و قوڵپی گریانم دەهات. جا ڕوو بکەمە کوێ، تا ئەو تەمەنە لە سنووری ماڵان بەولاوە هیچ کوێیەک و هیچ ڕێیەکم نەدیبوو و نەناسیبوو. چوومە سەر شەقامی گەورە، ڕۆییم و جا نازانم چەنێک ڕۆیشتووم. بەرە بەرە خاو و شل بووم و هێزم تیا نەما. چوومە سەر بەردێکی کەنار ڕێگەکە و لەسەری دانیشتم، هەندێ نانەڕەقەم دەرهێنا و زگی خۆمم پێ تێرکرد، جا دەستم کرد بە کەمانچەلێدان. ئاهەنگێکی خۆشی ئیتاڵیم گرتە بەر، ئەوەم لێ ئەدا و سا نازانم چەنێک ڕابوورد، لەپڕ دەنگی عەرەبانە هات. گەیشتە ڕاستی من و وا دەردەکەوت لە دووررا گوێیان لە دەنگی من و کەمانەکەم بووبێ، لە بەردەممدا راوەستان.

منیش خانەدانانە وەک پرینسێک بە فیزێکەوە هەستام و تەماشام کرد عەرەبانەیەکی لاندووی زۆر گەورە کە جێی هەشت کەسی تیا دەبێتەوە، چوار بارگیری تێ بەستراوە و لە پێشەوا عەرەبانەچییەکی پۆشتە و دوو ئافرەتی نازدار هەن، یەکێکیان زۆر جوان و تازەکچ، ئەویتر ئافرەتێکی قەیرە، ئافرەتەکە کەڵەگەت و بەخۆوە، پرچزەردی چاوشین، ڕەنگێکی سووروسپی هەبوو. تازەکچەکەیش یەکسەر وام هاتە پێشچاو کە موتڵەقەن ئەمە پەریی ئاسمانە ئەوەندە جوانە. نەم پەرژا تەماشای سیمای بکەم، کە ئەمە ڕەنگی چۆنە، چاوی چۆنە، برۆی چۆنە، دەمی چۆنە؟ هەر ئەوەندە بە شووعلەیەکی نوورم زانی.

ڕاستی من تا ئەو دەمە نەمزانیبوو ئافرەت چییە، وام دەزانی وەک مانگا ژنەکانی دێی ئێمە بۆ گەوڕماڵین و نانکردن بە تەپاڵە و منداڵ بەخێوکردن و دەغڵ هاڕین، مەکینەیەکن لە ئێسک و پێست دروست کراون. چووزانم تووشی هی وا دەبم بە جارێ جنسی لەتیفم پێ دەناسێنێ. من هەروا واقم وڕما، تەڕپیر لە پەنجەرەی عەرەبانەکەوە سەری کێشایە دەر و هەندێ جریوەی لێوە هات، لە زوبانەکەی نەگەیشتم، پێکەنی و منیش تووڕە بووم. ویستم بڕۆم، کەچی کچەکە بە شێوازێکی شیرینی ئەڵمانی لێی پرسیم:

- ئەفەندی، بۆچی تۆ ئەڵمانیت؟

- بەڵێ خانمەکە (لێرەدا لە لەهجەی فەڕەنسیدا مادام هەیە، کە بە ژن دەڵێن. ئێمە لە بری مادموزایل کە تایبەتە بە کچان، دەڵێین خانمەکە).

- ئەفەندی، گوێمان لە دەنگی کەمانەکەت بوو. زۆر خۆشت لێ ئەدا، ئێستە بۆ کوێ ئۆغر ئەکەی؟

- ئەگەر ڕاستت پێ بڵێم خۆشم نازانم.

- چۆن بە ڕێدا دەڕۆی و نازانی بۆ چ جێیەک دەچیت؟

- دەڕۆم و ناشزانم ڕووم لە کوێیە.

- کەوابێ کە نازانی بۆ کوێ دەچیت، فەرموو لەگەڵ ئێمە وەرە.

- منیش بۆ ئەمە قسمەت لەسەر ئەم ڕێیەی دانام، لە خزمەتتدام، سوار بم؟

- بەڵێ سوار بە.

پشت عەرەبانەکە جێی خزمەتکار بوو، خۆم هەڵدا و سوار بووم. عەرەبانەچی قامچیی لێ ڕاکێشا و ولاخ کردیانە چوارناڵە. ئەوەندەی نەمابوو شەبقەکەم با بیبا، لە خۆشیانا باکم نەبوو و دوو سەعاتی مابوو بۆ ئێوارە چۆن بچمە سلاوی؟ زۆریشم پێ گران بوو، هەروا لێی خوڕیی تا ڕۆژ ئاوا بوو. ئەو جێگایەی دوای عەرەبانەکە کە بۆ خزمەتکار کرابوو، جێی سێ کەسی تێری لێ دەبووە و منیش لێی ڕاکشام. توورەکەی نانەکەم نایە ژێرم سەرم و جار جار لە دێ وەچەتووتنم دەچنی، سەبیلێکم «پیپو» پەیدا کردبوو تا سەبیلێکی لێ بکێشم. تووتنم پێ نەمابوو، ئینجا چی بکەم، خۆ حەم عەرەبانەچییە توورەیە هێندە نەگریسە کە ئاوڕێکی لێ نەدامەوە و خۆشی و چۆنییەکی لەگەڵ نەکردم. کەوتوویشەتە

کلێشمەوە تا سەبیلێکی لێ با بدەم. لە دڵی خۆما وتم سواڵی تووتن عەیب نییە:

- هۆ عەرەبانەچی، تووتنت لا نییە؟

خوستی لە خۆی بڕی، نقەی نەکرد، وامزانی کەڕا، گوێی گرانە، لەتکە سێوێکم تێ گرت و بەر سەری کەوت، ئاوڕی دایەوە و بە دەنگێکی گڕ و لووتێکی منگنەوە بۆڵەیەکی کرد. وتی کابرا ئەوە چیت لێ بەر دەبێتەوە، وەخت بوو شەبقەکەم بخەی... وتم: «تووتن.» وتی:

- تووتن چی لێ دەکەیت؟

- ماشەڵڵا لە عەقڵ و کەماڵت، نازانی تووتن بۆ چییە؟

وەڵامێکی ناشرینی دامەوە، منیش وتم: دیارە زۆر نەفامی.

- لە تۆ نەفامتر؟

ئێمە گەیاندمانە ئەم تێکەڵییە، خانمەکەم تێی خوڕی: «مۆرینۆ بێدەنگ بە، عەرەبانەکە ڕاگرە.» جا بە منی گوت: «ئەفەندی فەرموو دابەزە.» خۆم فڕێدایە خوارەوە، دەرگەی عەرەبانەکەی کردەوە و وتی: «وەرە ژووری.» لەو کەیفەدا کە چوومە ژووری، لە تەنیشت خانمەکەمەوە دانیشتم و بە مەعناوە *ئەحا*یەکم لە کابرای عەرەبانەچی کرد، هەنگڵ هەنگل ئاوسا. بە کەماڵی شەتارەتەوە شەبقەم داگرت و ڕووم کردە ئافرەتەکان و وتم: «ئێوارەتان باش.» قاقا پێکەنین، ناویان پرسیم: «فەرمووم، ئالفرێد مۆلەر ئەفەندی.» خانمەکەم وتی:

- ئۆخ چەند ناوێکی خۆشە.

- بەڵێ خۆیشم دەزانم کە ناوێکی زۆر خۆشە.

- تۆ گۆرانیبێژی؟

- نەخێر، هەروا بە کەیفی خۆم کەمان لێدەدەم.

- هیچ سنعەتێکی تر نازانیت؟

- نەخێر، بەڵام وەک ئێوە ناونیشانی من دەپرسن و لە دێدا هەموو کەس دەمناسێت، ئەگەر منیش لە ئێوە بپرسم کە نەناسراون عەیبە یان نا؟

تەڕپیر دیسان پێکەنی، بەڵام خانمەکەم فەرمووی: «نەخێر عەیب نییە، ئەو *سارینا پۆتۆیە* و منیش *میکایلا قورتساس*.»

- چۆن، هەروا ئەم ناوە ڕووتانە و هیچی تر!؟

- من ڕاهیب پێی وتبووم لە ئەورووپا هەر بنەماڵەیەک کە نەختێ ناسراو بێ، لە پێش ناوەکەیەوە «دو» یاخود «فون» دادەنرێ و بە لەقەب ناودەبرێن، یا حەزرەت، یا جەناب، یا ئاغای فڵان... دەبوایە مادام سواری عەرەبانە بوون و عەرەبانەچییەکی وا بەفیز و تووڕەتان هەیە، لەقەبێکتان ببووایە. خۆیشتان نەتانبووایە، بتانخواستایە، تا لەم ڕێ و بانە هەموو کەس شەرمی لێ بکردنایە.

خانمەکەم زەردەخەنەیەکی ناڕەزایی کرد و وتی:

- جەنابی ئەفەندی، تکایەکم هەیە، ئێمە وا بووین بە هاوڕێی یەک و ئەوەندە ناونیشانی خۆمان هەڵدا، جارێ لەوە زیاتر مەپرسە تا خۆمان پێت دەڵێین. دوایی یەکتر دەناسین.

ڕاستی ئەمە نیوەهەڵکاڵانێ بوو، منیش کەمێ تووڕە بووم، خۆ هێجگار ئەم هەموو تێکەڵییەمان بە بەیندا ڕابورد، ئەم جووتەش ئەوەندە ئیکرام نازانن کیسەتووتنەکەیان بخەنە بەردەمی من و بڵێن فەرموو سەبیلێ تێ بکە.

هاتم بە کوردی داوای تووتنیان لێ بکەم، دوایی وتم با بە نەزاکەت بێ خۆشترە. سەبیلەکەم هێنایە دەرێ و وەک بلوێری منداڵان کە لە قوڕی سپی دروست دەکرێ و فووی پیا ئەکەن و وەک دووزە لە دەنگی دێ، فیکەم پیا کرد. تەڕپیر وتی: «حەو! بلوێرژەنیش دەزانی.» ئینجا تەواو خەست بوو. بە تووڕەییەوە وتم: «نەخێر، بلوێرژەن نیم، بەڵام سەبیلەکەم تووتنی تیا نییە. داوام لە عەرەبانچییەکەتان کرد نەیدامێ، ئەوەتا بە ئیشارەت سەبیلەکەم خۆی داوای تووتن دەکات و ئێوەش گوێی نادەنێ، چی بکەم، بێ تووتنییە!

سارینا دیسان تا هێزی تیا بوو، بە دەنگێکی بەرز دایە قاقای پێکەنین... خانمەکەم وتی: «تۆ کە دەزانی ئەورووپییەکان «دۆ» و «فۆن»یان هەیە، بۆچی نازانی ئافرەتان تووتن ناکێشن؟» وتم: «حەو! ژنانی ئێمە لە پیاو زیاتر تووتن دەکێشن. هەموو جارێ کلکی سەبیلەکەیان دەخەنە گوێچکەی منداڵ و لە سەرەوە فووی پیا ئەکەن، گوێی قانگ دەدەن. ڕەنگە پوورە سارینا بزانێ، مادام وایە با دابەزم، سەری خۆم هەڵگرم.» خانمەکەم وتی: «ڕاوەستە بزانم لە چی وا سەغڵەتت گەیوەتێ؟» «یەکەم لە عەرەبانەچییەکەتان کە زۆر چرووکە و سەبیلێ تووتنی لە پێشچاوە. دووەم لە پێکەنینی تەڕپیر، سێیەم ئەوا گریمان خۆتان تووتن ناکێشن، ئەی نەدەبوو بۆ میوان تووتن لەگەڵ خۆتان بێنن؟»

لێرەدا تەڕپیر دیسان هەڵی دایێ و وتی: «ئێمە چوزانین لە ڕێ بە خزمەت تلیاککێشیکی وەک تۆ دەگەین.»

بەم تێهەڵقورتـــانە وازی نەهێنـــا، دیســـانەوە پێکەنیـــنە ناموبارەکەکەی دەستی پێکردەوە و بە زۆر خانمەکەیشـم هاتە پێکەنــین. خــوایە بەقوربانــت بــم! بە پێکەنینــی میکـایلا دەڵــێن پێکەنین و بە قڵپەقڵپی تەڕپیریش هەر دەڵێن پێکەنین. چاریشـم نییە، ئەوا وتمان لە عەرەبانە هاتمە خوارێ، بەم شـەوە تـاریکە ڕوو بکەمە کوێ؟

لەم دارسـتان و جەنـگەڵ و بیابـانەدا چـی بـکەم، هەر دڕنـدە دەمخوا. لە دڵی خۆمدا بڕیارم دا کە ئەگەر ئەوان پێکەنین، هیچ سـەغڵەت نەبـم. هـــی هـــی وەک جوانـووی ئەسـپ بحیلێـنم. هەروا لەبەرخـۆمەوە لـێکم دەدایەوە و مـاتەمین دایگرتبـووم. خـــانمەکەم لێــی پرســـیم: ئەوە مـۆلەرە ئەفەنــدی چـــی لێــک دەدەیتەوە؟ نیوەی هەزار پێنجسەدە.

- چی لێک بدەمەوە؟ بێ تووتنییە!

- باشە تووتنت لە مۆرینۆ بۆ ئەسێنم، بەڵام نـابێ لای ئێمە سەبیل بکێشی. هەڵسە بچۆرە لای عەرەبانەچییەکە، پێی دەڵێم تووتنــت بــاتێ. ئەمەم زۆر پــێ نــاخۆش بــوو، مـن گـاڵتەم بە عەرەبانەچی کردووە و ئێستەش بچم لە لا دانیشم و سـەرێ تووتنم بداتێ، ڕووم کردە میکایلا و وتم:

- خانمەکەم، من لێرە ئێوە نـاڕەحەت نـاکەم، کە سـەبیلەکەم تێکــرد، ســـەرم لە پەنــجەرەکەوە دەبەمە دەرێ، دووکەڵەکەی دەدەم بە بادا.

دیسان تەڕپیر هەڵی دایەوە و وتی:

- ئەفەندی، میکایلا کە ئەمەندە تۆی خۆش دەوێ، بۆچی سەغڵەتی دەکەی؟

ئیتر نەیهێشمە ڕەت، بانگری کرد مۆرینۆ ڕاوەستە، عەرەبانەکەی ڕاگرت و بە منی گوت: «فەرموو لای مۆرینۆ هەتا ئەتوانی سەبیلە بکێشە، بەڵام ئاگادار بە، لە پشتەوە دووکەڵمان بۆ نەیەت.

بێدەسەڵاتییە و لە دابەزیندا ترسی گیان! ناچار بۆ سەری توتن چوومە لای عەرەبانەچی و ئەم پەت پەتییەم بەسەر هات. تووتنم لێ بوو بە دانەگەنمەکەی حەزرەتی ئادەم. ئینجا وتم:

- عەرەبانەچی، من بۆ سەبیلکێشان هاتمە لای تۆ، وامەزانە دەرکرابم.

عەرەبانەچییەکە کیسەتووتنەکەی فڕێدایە بەردەمم و وتی:

- نەخەڵەتابی لە سەری زیاتر تووتن دەربێنی.

کە وای گوت، ئینجا ئەوەم کەوتە خەیاڵ کە چنگێکی لێ بدزم. ئەگەر وای نەگوتایە، ئەوەم بە خەیاڵدا نەدەهات.

هەتا گرتی، سەبیلەکەم داگرت و چنگێکیشم لێ کردە باخەڵم و کیسەکەم فڕێدایەوە. هەر تەماشایشی نەکرد، کردیەوە بە قەدیا. ئەوە تووتن دەست کەوت و سەبیلم تێکرد، ئینجا ئاگر لە کوێ پەیدا بکەم. ئێستە بەم هەزار حاڵە تووتنم لە عەرەبانەچی سەندووە، داوای ئاگریشی لێ بکەم، دێ بە گژما. چی بکەین چاکە! وتم: با داوا لە سارینا بکەم، ئەگەر خۆیشی

نەیبێ، ئەو بە عەرەبانەچییەکە بڵێ ئاگرم بداتێ. وەرگەڕامەوە و بانگم کرد: «جەنابی عیفەت و نەزاکەتپیشە سارینا خانم، لە سایەی تۆوە تووتنم دەست کەوت، بەڵام ئاگر دەست ناکەوێ.» لەم ئەلقاب و فەصاحەتەی من، ئەمجارە بە خۆشی خۆشییەوە پێکەنی، بەڵام خانمەکە بە قاقاوە وتی: «لەم ئیحتیراماتەش بەشی ئێمەی تیا نەبوو؟» تۆ بێ ئەلقاب جوانی زادەگان، بێ ئەلقاب و جوان، بێ ئارایش و تواڵێت. سارینا تووڕە بوو و وتی: «کەوابێ من ناشرینم! تۆش گۆڕت بێ سەبیلەکەت ڕاگرە، بەیانی دەگەینە دێیەک لەوێ ئاگری بخەرە سەر. » میکایلا بانگی کرد: «وەستا مۆرینۆ، ئاگر بدە بە بەگ.» ها ها ها، بە مەتحێک بووینە بەگیش. عەرەبانەچی خودگیری نەکرد، قوتووی قاوی دامێ، سەبیلم داگیرسانم و لنگم نایە سەر لنگ. باوکم لە کوێیە، تا سەیری ئەم عەزەمەتەم بکا. نیو سەعاتێ سەبیل دەوامی کرد، ئینجا فتم و هەر چاوەڕوان بووم تا بانگم بکەنەوە ئەودیو. دەنگ نەبوو، ئینجا توورەکەم نایە ژێر سەرم و بحی کەوتمە کنکەخەو. سا نازانم چەند نوستبووم، لەپڕێکا عەرەبانە بە جارێ هەڵبەزیو و وامزانی لەت و پەت بووە. کە خەبەرم بووەوە تێفکریم عەرەبانەچی نوستووە. میکایلا بانگی کردووە و بۆی خەبەر نەبۆتەوە، ئینجا من بانگم کرد و دیسان هەڵنەستا. میکایلا گوێی لە دەنگم بوو، بانگی کرد: «ئالفرێد ئەفەندی، تووخوا ئەو ماندووە، هەڵی مەسێنە. خۆت بزانە عەرەبانەکە ڕەوڕەوەکەی نەشکاوە؟ بازم دایە خوارێ و تێفکریم عەرەبانە هیچی لێ نەهاتووە، بەڵام وڵاخەکان وەستاون و منیش بە فرسەتم زانی، قاچێکی مۆرینۆم گرت و ڕامکێشا، لەپڕ خەبەری بووەوە. زۆر

تووڕە بوو و وتی: «بۆچی من سەگم لاقم ڕادەکێشی؟» ئەو تووڕە بوو، من تووڕە بووم و لەودیوەوە میکایلا بانگری کرد: «مسیۆ مۆلەر، سەرکەوەرەوە جێی خۆت.» منیش وتم باشە. بەلام خۆ من لە سەبیلکێشان بووبوومەوە، کەچی گوێی نەدامێ. وتی: «جارێ بچۆرەوە شوێنی خۆت.»

چارم نەما، کلکم بە خۆمدا گرت و سەرکەوتمەوە لای عەرەبانەچی. سا نازانم چەند سەعاتی تر ڕۆیوین، هەموومان بە جارێ خەومان لێکەوتبوو. من کە چاوم کردەوە، ڕوانیم ولاخەکان وەستاون، لە شوێنێکدا کە بن دارستان و شاخ و سێبەری درەخت، دنیای تاریک کردووە. شەوقی چرای عەرەبانەکە بەردەمی ولاخەکانیشی نابینێ- پیرێژنان حیکایەتیان بۆ کردبووم کە لە جەنگەڵی وادا، دێو و پەری و جنۆکە و دڕندە هەیە. سامم لێ نیشت و لە پێشچاوم جەردە و دێو ئەڕۆین. وەک ئەوەبوو گوێم لە دەنگی پێی زەلام بێ، هێز لە ئەژنۆما نەما، لەپڕێکدا گرمەیەک وەک پژمەی جانەوەرێک پەیدا بوو. من کەوتمە خوارێ و لە زرمەی من، عەرەبانەچییەکە خەبەری بووەوە و تێی خوڕیم: «کوڕە کێی؟» هاوارم کرد: «وەستا مۆرینۆ منم.» وتی: «بۆچی کەوتی؟» وتم: «پانزە هەنگاو لە بەردەمماندا دەنگی پێی زەلام و پژمەی جانەوەرێکم بیست.» عەرەبانەچی پێکەنی و وتی: «خوا هەقە پاڵەوانی چاک و دلاوەر بە جەنگی. لە پژمەی ئەسپەشێت کەوتوویتە خوارێ.» لەم گفتوگۆیەی ئێمەدا میکایلا خەبەری بووەوە و بانگی کرد: «ئەوە چییە؟» مۆرینۆ لە پێش مندا وەلامی دایەوە و وتی: «خانمە، ماشەڵلا ئەفەندی میسیۆ مۆلەری پاڵەوان، ئەمەندە ئازایە کە لە پژمەی بارگیر کەوتۆتە

خوارێ.» ئەم پلاری عەرەبانەچییە کاری کردە جەرگم، بەڵام هێشتا ترسم بەسەر نەچووبوو و لە دڵی خۆمدا وتم: «ئێ با بگەینە شاتوو و ترسم نەمێنێ، خۆم دەزانم چیت پێ دەکەم.» میکایلا وتی: «ڕەنگە لە خەودا ترسابێ، قەیناکات.» منیش وتم: «خانمەکە، من لەوانە نیم بترسم، مۆرینۆ درۆ دەکات.» وابزانم مۆرینۆ درۆزنی پێ ناخۆش بوو، قامچی بۆ وڵاخەکان ڕاوەشاند. دەیویست تێم بگەیەنێت کە منیش وا دەداتە بەر قامچی. لەتاو قامچی وڵاخ کەوتە لۆقە و منیان بەجێهێشت. بانگم کرد: «هەی، لە ڕێی خوا بەجێم مەیەڵن.» عەرەبانەچی وتی: «قەیناکە نەختێ پێ هەڵگرە، بۆ بەیانی دەمانگەیتێ.» ناچار ڕام کرد و خۆم گەیاندە پەنجەرەی میکایلا. بانگم کرد: «بەجێم دێڵن!» سارینا وتی: «بەخوا بۆ بەجێهێشتن باشی، بەڵام ئەگەر بەجێ بمێنی، من پەکی پێکەنینم دەکەوێ. برۆ سوا بە.» عەرەبانەچی ڕاوەستاند، ئینجا کە ترسی بەجێمانم نەما، خۆم کوتایە بەردەمی خانمەکەم و وتم:

- تۆ سەبارەت بە من زۆر بە ڕەحمی. من کەوتوومەتە خوارەوە، هەموو لەشم تێکشکاوە، تووخوا ئیتر مەمنێرە لای عەرەبانەچی.

فەرمووی وەرە لامان سوار بە، منیش خۆم هاویشتە عەرەبانەکە.

- سەبیلمان لە لا ناکێشیت؟

- ئیتر تۆبەم بێ، حەز دەکەی هێجگاری توتن ناکێشم.

- نەخێر، خۆ هەمیشە لە ڕێ و بان نابین. لە شاتووەکەدا دەتوانی سەبیل بکێشیت.

- ئەی بۆچی لە شاتوو لێک جوێ دەبینەوە؟

دیسان سارینا هەڵی دایە و گوتی: «تا خۆمان حازر کەین، کە گەیشتینە شاتوو میکایلا لە پرۆنس ئالفرێد مارە بکەین. هەرچەند شەرمەزاریش بووم، ئەمما ئەمە گاڵتە بوو و بوو بە مایەی هیوا و ئومێد. ئیتر چەسپییە کەللەمەوە. میکایلا لە بەختی من پێکەنی و شەرمەکەم بەسەرچوو.

بە عەرەبانەچی وت: «مۆرینۆ نەختێ گورج لێ خورە، با زوو لەم ئورمانە دەربچێن.» قامچیی کێشا و سا هەروا ڕۆیین تا ڕۆژ بووەوە. بە ڕاستی گزنگی هەتاو لەو دەم و شاخ و کەناری خەنگەڵستانی و ئورمانە زۆر شاعیرانە بوو. هەندێکی تر ڕۆیین و گەیشتینە شوێنی جۆگەئاوێ. هارە هارە دەڕوا، ڕوو دەکاتە دەشتی میرغوزار و لالەزار لەوێ دابەزین. مۆرینۆ وڵاخەکانی کردەوە و ئاوی دان، ئالیکی کردن بە سەرەوە. خانمەکەم وتی: «ئەفەندی برسیت نییە؟»

وتم ئارەزووی ئێوەیە. لەسەر چیمەنەکە مۆرینۆ سفرەی ڕاخست، سفرەیەکی شاهانە. بانگیان کردمە سەر سفرە، منیش ڕام کرد چووم توورەکەی نانە ڕەقەی خۆم، دەرکەم کردەوە و بە جارێ هەڵم ڕشتە سەر شەکرلەمە و کفتە و بریانییەکە. سارینا ئەو دەشتەی پڕ کرد لە قاقا. من زۆر توورە بووم و وتم: «من بە سواڵکەر دەزانیت؟» خانمەکە فەرمووی: «توورە مەبە، سارینا حەز دەکات لە ناو ئەم دارستانەدا قاقا بەجێ بهێڵێت.» لە نان بووینەوە، میکایلا بە خەمێکەوە وتی: «ئینجا ئەگەر لوتف بفەرمووی ئێرە جێی کەمانە.»

ڕامکرد کەمانەکەم هانی و وتم: «چی ئارەزوو دەفەرمووی؟» وتی: «ئەگەر بەستەی هیجرانی بەناوبانگی لویجی بخوێنی زۆر مەمنوون دەبم.» خوا و ڕاستان من خۆم زۆر ئەو بەستەیەم لا خۆش بوو، چاکیشم دەزانی. عەینەن هیجرانی کوردی، بەڵام گلەیی لە بێوەفایی یار، بە هەموو پەژارەی خۆمەوە کەمانەکەم هێنایە واوەیلا و خۆیشم بە ڕۆ ڕۆ ئەو بێشەیەم زرنگاندەوە. کاتێ ڕوانیم، خانمەکەم ڕووی کردووە بەولادا و دەستەسرێکی ئاوریشمی بە دەستەوەیە و چاوی دەسڕێ. زۆر پەشیمان بوومەوە، وتم ئیتر ئەم مەقامەی بۆ ناڵێم. قاوەڵتی و گۆرانی ناو دارسان بڕایەوە و سواری عەرەبانە بووینەوە. ئینجا قەدرم زیادی کردبوو، تەنانەت مۆرینۆی عەرەبانەچیش بە خۆشەویستییەوە لێی دەڕوانیم.

ئینجا عەرەبانەکە بەسەر شۆستەیەکی ڕێکوپێکدا هەروا لە خۆیەوە وەک ئەوەی خلیێتەوە، بێ خرپە و خشە دەڕۆی. منیش لەناو عەرەبانەکە بەرامبەر خانمەکەم دانیشتبووم، تاو تاو بە ڕێزێکەوە تەماشای چاویم دەکرد. بەم لادێیی و هیچنەزانییەی خۆمەوە، خەم و پەژارەیەکم لە چاوانیدا دەدی. لە بەختی خۆی ناڕازی بوو، بەخوا ئەو چاوە گەشانە بە ماتییەوە هێندە جوان بوون، نیو نیگایەکیان جەرگی ئینسانی دەبڕی. ئینسان لە شیرینی ئەندامی، زیاتر عاشقی کار و شێوەی ناسکی دەبوو. خەیاڵم دابووە حاڵی ئەو و خۆیشم ماتی و ماتەمی گرتبوومی. خەو بردمییەوە و کە خەبەرم بووەوە تاریک بوو، شەو بەسەردا هاتبوو. خانمەکە فەرمووی: «دیارە لە عەرەبانەدا ماندوو بووی، کە وا من بیرچووەوە و تێر نووستی.»

- زۆر شـەرمەزارییە بـۆ مـن، کە جێگـایەک تەشـریفی تـۆی لێبێ بنووم. لە خەوەکەیشدا هەر لە خزمەت تۆدا بووم.

خـوا و ڕاسـتان ئەمەی زۆر لا خـۆش بـوو. بە درۆیشـی نەخستمەوە، ئینجا لێی پرسیم:

- قوربان، زۆرمان ماوە بۆ شاتوو؟

- بڕوانە لە پێشمانەوە ڕووناکی چرا دەبینی، ئەوە دێیەکە و بەنـاو ئەو دێـیەدا تێـدەپەڕین. نیـو سـەعات لەو دێـیە بەولاوە، دەگەینە شاتووەکەی خۆمان.

مـن لە خۆشـی ئەوەدا بـووم کە ئیتـر لە سـەفەری نـاو عەرەبـانە دەردەچـین و دەگەیـنە مەنـزڵ. کەچـی تەڕپیـر وتـی: «ئەوە میکـایلا دڵخۆشـیت دەداتەوە، هێشـتا زۆرمـان مـاوە و نەختێکی تـر دەگەیـنە سـەر پردێکی گەورە، ئەو پـردە نیـوەی ڕێـیە.» زۆری نەمـابوو بـاوەڕی پـێ بـکەم، لە بەختـی مـن خانمەکە فریاکەوت و وتی: «باوەڕ مەکە.» هێندەی پێ نەچوو بە دەنگی ڕەوڕەوەی عەرەبانەکە زانیمـان گەیشـتووینەتە سـەر پردەکە. سا تێیەڕین و تێنەپەڕین، مۆرینۆ بە دەنگێکی مەردانە، بانگی کردە پێش خۆی: «کوڕە کێی؟»

عەرەبـانە ڕاوەسـتا و ڕوانـیم لە پەنـجەرەی هەردوو دیـوی عەرەبـانەکەوە دوو سـەرزل سـەریان کرد بەنـاو عەرەبانـاکەدا. دوو کەلـلەی کـوڵکنی جەهەننەمـی ناوچـاوان گـرژ، یەکێکیـان دەستێکی هەڵبڕی و وتی: «مەجووڵێن.» کە وای گوت، ئەمەندە ترسـم لێنیشـت، ئەو شـەوە کە لە پـژمەی بـارگیرەکە کەوتـمە خـوارێ، لەچـاو ترسـی ئیمشـەودا جەژن بـوو. لەگەڵ ئەوەشـدا چونکە چاوم لە چاوی خانمەکە بوو، ویستم وەک پاڵەوان بێمە

مەیدان، بانگم کرد: «چیتان دەوێ وا سەرەڕێ بە ڕێبوار دەگرن؟» یەکێکیان وتی: «تۆ کێی پیسی مردار، ئەوەندە لە خۆتدا شک دەبەی بێیت بە گژ ئێمەدا؟»

میکایلا بە منی وت: «تۆ دەنگ مەکە.» خۆی مەردانە دەستێکی نایە کەلەکەی و بەرزبووەوە. ڕووی کردە کابرا و وتی:

- بە من بڵێ، چیت دەوێ؟

کابرای چەتە بە شێوەیەکی چوختی و بێعارانە وتی:

- ئۆو، ئوو، جەنابی خانم بچکۆلە وا بە توندی نا، نەختێ بە هێواشی. ئێمە سێ کەسین و هاتووینەتە سەر ڕێت، بەشی گوزەرانی دە پانزە ساڵێکمان بدەرێ داوێنت ماچ دەکەین و دەڕۆین بە ڕێی خۆمانا.

- ئەی ئەگەر نەبێ، چی دەقەومێ؟

- ئەوسا خۆی دەیزانی، ئۆباڵتان بە ئەستۆی خۆتان.

کە زانیم خانمەکە هاتە زبان و توند بوو، منیش لە دوای ئەوەوە وتم: «ئاغا، بۆچی خەڵک کرد و کۆش بۆ ئەوە دەکەن بیدەن بە ئێوە! ئەوەتا پێت دەڵێم، دەڕۆی برۆ، نارۆی پەلت دەگرم و دەتدەمە دەست پۆلیسخانە، ناوەجاخ.»

کابرا کە ئەمەی بیست، دەمانچەکەی ئاراستەی ناوچاوانم کرد، ئەویتریان کە لە پەنجەرەکەی ئەولاوە سەری هێنابووە ژوورەوە ڕوانیم هیچی بە دەستەوە نییە. لەوە دڵنیاییم پەیدا کرد کە هیچی پێ ناکرێ، هەوڵی ئەوەم دەدا ئەمیان بەیدەست بکەم. کتوپڕ پەلاماری دەمانچەکەی دەستیم دا، پەلم گرت و

بام دا. دەمانچەی لە دەست کەوتە خوارێ بۆ ناو عەرەبانەکە، ڕەفیقەکەی لەودیوەوە سەری تەواو هێنایە ژوورەوە تا دەمانچەکە هەڵگرێ. ڕوانیم ئەو میکایلا ناسک و نازدارە وەک بەچکەشێرێ هاتە جۆش و ملپێچە ئاوریشمییەکەی لە مل داگرت و ئاڵاندیە ملی کابرا و توندی کرد، خستییە لرخە لرخ. سارینایش سەرێکی ملپێچەکەی گرتبوو و توند ڕای دەکێشا.

لەپڕ زرمەی دەمانچەیەک هەستا و نیوەخنکاو بە لادا هات. نەمانزانی ئەمە کێ بوو؟ کە لە پەنجەرەکەوە تەماشامان کرد مۆرینۆی عەرەبانەچی بوو، لەسەرخۆ هیچ نەشڵەژابوو، بە هێواشی وتی:

– خانمە ئەفەندی مەترسە هیچ نییە. ئیتر ئەندێشەمان نەما.

کە ئەو وای وت، منیش وتم: «ئای وەستا مۆرینۆ، یەکێکی تریان وا لێرە بە تەڵەوە بووە و پەلم باداوە. وتی: «ئافەرین بۆ تۆ، تۆ ئەو کوڕە بوویت کە ئێمە نەمان ناسیبووی.» کە وای وت ئەحایەکی ترم کێشا و بە دەماخ قۆڵی کابرام وا بادا هاواری کرد، وتم: «کافر خۆت ڕاوەشێنە و دەستت توند بقووچێنە، پارەکان کە لە خانمەکەی منت وەرگرتووە، لە دەستت نەکەونە خوارێ.»

لەو وەلوەلە و هەرایەشدا دیسان تەڕپیر دایە قاقای پێکەنین، ئەمما مۆرینۆ وتی: «مەیکوژە با ئەمەیان بە زیندوویەتی ببەینە پۆلیسخانە و بیخەینە تەڵەوە، مۆرینۆش هات و دەرگای عەرەبانەکەی کردەوە و توندوتۆڵ مەیکە چنگیمان پێچا. کە هۆشم هاتەوە، تەماشای دزەم کرد فیلەتەنێ دەبوو، ئینجا ورە گرتمی کە من چۆن وێراومە دەست بدەمە دەستی ئەو

پەتیارەیە. وەک جوولەکەکەی زرێبار ئەوکات زۆری نەمابوو زارەترەک بم. لێم بوو بە مەراق ئایا کە ئەمانە هاتن دەوری ئێمەیان دا، مۆرینۆ لە کوێ بووە، مەگەر یەکێکیان چووە لە پێشدا مۆرینۆ بگرێ! جا مۆرینۆش بازی داوەتە خوارێ و لەگەڵ کابرا تێک هەڵچوون، فرسەتی لێهێناوە و خەنجەرێکی لە کورتە کەلی ئەویان داوە و کوشتویەتی، ئینجا هاتۆتە فریای ئێمە. دەنگی ئەو دەمانچەیە هی ئەو بوو کە نێچیرەکەی خانمەکەمی کوشت.

ئەمە هەرسێکمان ئازاییمان نواند، وەلێ ئەگەر هەقی خوات دەوێ. خانمەکە هونەری لە هەمووان زیاتر بوو، کچێک دەرودەشت و دز و جەردەی نەدیبێ و بەو جەسارەتەوە دزە بەیدەست بکات، ئازایەتی چاک ئەوەیە. مۆرینۆ گوریسێکی خستە قۆڵی دزەوە و سەری گوریسی بە ملی دوای عەرەبانەکەوە بەست و وتی: «تا دەگەینە دێ، دەبێ گورگەلۆقە بکەی.» هەرچەند میکایلا وتی: گوناحە با سواری عەرەبانەکەی کەین.» وتی: «بشمکوژی سوار نابێت!»

مۆرینۆ سوار بوو و لێمان خوڕی، لە ڕێ هەر باس باسی جەردە و ئازایی بوو. نازانم چۆن بوو و هێشتا شەرمەزاری ئەوەم و لە دڵما گرێیە کە بۆ ئەوەی پێم بڵێن ئازایە درۆیەکم هەڵبەست. ئێستاش دەترسم درۆ دەرکەوێ (یاران وەسیەت بێ خۆتان لە درۆ بپارێزن، درۆزنی لە هەموو شتێک خراپترە) بە خانمەکەمم وت: «من هەر ئازا بووم و لەپێش چاوی سارینا خۆم نانوێنم، جارێکی تریش لێم قەوما. میکایلا بە پێکەنینەوە وتی:

- هەی ناشێ نەقەومابێ؟

- قەوما و بڕایشەوە.

- چۆن؟ خۆ نەیانکوشتی.

- لە سایەی سەری تۆوە کێ ڕایەی دەکەوێت.

- سا کەواتە بۆمان بگێڕەوە با دزەیش گوێی لێبیت و نەڵێ پیاوی حیز گرتوومی، با بزانێ پیاوی ئازا گرتوویەتی و داخی لە دڵا نەمێنێ.

- ڕۆژێ باوکم هەندێ پارەی لەسەر مسکێنەکان بوو، ناردمی قەرزی بۆ بستێنمەوە، دێیەک هەبوو ڕێگای چوار سەعات لە ئێمەوە دوور بوو، لەوێ پارەکانم سەندەوە. هاتم بگەڕێمەوە، ئێوارە درەنگ بوو و دێهاتییەکان زۆرم لەگەڵ خەریک بوون بەند نەبووم. هاتم و بە ڕێوە تەنها چەقۆیەکی باریکم پێ بوو.

میکایلا پێکەنی و وتی:

- ئەیەڕۆ! چۆن پیاوێکی وەک تۆ بە تەنها چەقۆیەکەوە کەوتووەتە ڕێ؟

- پیاوی ئازا چەکی بۆ چییە؟ خۆ تۆ ئەو چەقۆیەشت پێ نەبوو.

- ئینجا وا بە ڕێدا ئەڕۆیم و گۆرانیم ئەوت.

سارینا وتی: «ئەی کەمانەکەت لەگەڵ لێ نەدەدا؟» «نەخێر هێجگاری لە ماڵی باوکم دەرنەکرابووم تا کەمانەکەم پێ بێ. گۆرانیم دەوت و لە پەنای بنچکێکدا حەوت زەلامم لێ

ڕاپەڕی.» سارینا: «ئافەرین بنچک درەختی توبی نەبی. برادەر بۆت هەڵناسووڕێ تا زووە ڕاکە نەتگرن.»

«چۆن ڕاکەم؟ بە جارێ دەوریان دام. لەبەر ئازایی من هەر حەوتیان نەیانوێرا بێنە سەرم. یەکێکیان بانگی کرد، چی پارەت پێیە بماندەرێ. جارێ وتم ئەمە حەوتن، دیارە تەنها پیاوێک دەرەقەتی حەوت کەس نایەت، وا چاکە چیم پێیە بیاندەمێ.»

دوایی وتم: «باوکم باوەڕ ناکات ڕووتیان کردبێتمەوە، چونکە لای ئێمە ئەسڵەن دز و جەردە هەر نەبووە و ناشبێت.»

دیسان تەرپیر دەستی کردەوە بە پێکەنین: «بیرەوەریت باش نییە، لە لایەکەوە حەوت جەردە دەوریان دابوویت و لە لایەکی تریشەوە دەڵێیت لای ئێمە دز و جەردە نییە.» تێفکریم ڕاست دەکات. خراپ گیرام، یەکسەر هاتمە دەست و وتم: «ئەوانە جەردەی لای ئێمە نەبوون، زانیبوویان پارەم پێیە لە لایەکی ترەوە هاتبوونە سەر ڕێم.»

- دەی ڕێکی خە، با بزانین دوایی بە چی گەیشت؟

«دوایی بە چی گەیشت؟ وەک شێر ڕاپەڕیم، دەستم دایە چەقۆکولە، هیچیان نەیانوێرا جم بدەن.» ئەم هەویرەی من دەستم کردبوو بە شێلانی ئاوی زۆری دەویست. بەرەکەت دا گەیشتینە دێکە و لەبەر قەڵە ڕەشەکەدا ڕاوەستاین، جەندرمەکان بە کەماڵی ڕێزەوە هاتن و ماندوو نەبوونی میکایلایان کرد و دزەیان برد و ئێمەش کەوتینە ڕێ. زۆر نەڕۆیشتین گەیشتینە بەر دوو دەروازەی زۆر گەورە، کە عەرەبانەکە لە گۆشەیەکیەوە دەچووە ژوورەوە، سوار بە

ڕمەوە پیایا تێدەپەڕین. خانمەکە فەرمووی: «ڕۆستەم ئالفرێد ئەفەندی، ئەمە شاتووەکەیە کە هەر دەتوت نایگەینێ.»

# فەسڵی دووەم

## شاتوو

جارێکیان ڕاهیبەکە باسی داستانی شاتووی بۆ کردبووم، کە لە دەورەی دەرەبەگیدا کۆشکی قوللەدار، وەک قەڵای مەحکەم دروست کراون و دائیرە و حەشەمی ئەو پرێنسانە بووە کە تێیدا بوون. من وام ئەزانی کە ئەمە خانوویەکە پەنجا شەست هۆدەی هەیە، کە گەیشتینە بەردەمی شاتوو، خانمەکە وتی: «ئا ئەمە *شاتووە*.»

جارێ تێنەگەیشتم شاتوو چۆنە، دوایی ڕاهاتم و شارەزا بووم وا بۆتان دەگێڕمەوە.

ئەم بینایەی ئێمە چووینە ناوی شاتوو لۆرانسە، لە ساڵی ١٧٣٦ دروست کراوە. نازانم ئەو لۆرانسە کێیە «ڕەنگە لۆرانسی ١٩٣٥ بێ، ڕۆحی لەو زەمانەدا وەک سرسرییە هۆدی کاری کردبێ» خۆ من هێشتا میکایلا و سارینام تەواو نەناسیوە، تا بزانم لۆرانس کێیە؟

جارێ ئەو دائیرەی شاتووە کە من شارەزای هەندێکی بووم، تا چاو کار دەکا دەوران دەور دەیوارێکی زۆر مەحکەمی بڵندی وەک دیواری قەڵای تێدا دروست کراوە، دەروازەیەکی گەورەی تێخراوە. کە لە دەروازەکە دەچییە ژوورێ، سەقامێکی دە مەتری شۆستە و ئەمبەرەوبەری شەقامەکە باخ و باخچە و درەختی گەورە و کەڵەگەت سەریان

کێشاوەتە ئاسمان. لەمبەری ڕێوە و لای ڕاست، دائیرەی قاپیەوان و پاسەوان، لای چەپ دائیرەی خزمەتکار و لەولایشەوە جێگای چێشتخانە و عەرەبانەچییە. هەر فەرمانێ لە ئەسڵی شاتووەوە بدرێ، زیلێک لە هۆدەی خزمەتکاراندا هەیە بانگیان دەکەن، جا خزمەتکار دێ و فەرمان بەجێی خۆی دەگەیەنێت.

ئێمە کە گەیشتینە بەر دەروازە دەستە و دائیرەی شاتوو هاتن بە پیرمانەوە و لەو بەردەرگایە تا بیست دەقیقە هەر ماچ و مووچ و یەکتری لە باوەشگرتن بووە، منیش وەک سەبەتەی پەت پچڕاو بێ ماچ و مووچ و باوەش کەوتووم.

لە پاش چەندێ یەکێ لە ئافرەتەکان ڕووی کردە میکایلا و پرسی:

- ڕۆڵەکەم، ئەم ئەفەندییە کێیە؟

- پووری ئەوە هاوڕێمانە «ئالفرێد مۆلەر».

کە وات وت منیش شەبقەم داگرت، بۆچی لەو تەلاشەدا دەستم نەچێ بە کوێی شەبقەکەما و تیا عاسی بی... بۆم نەکرا تەوقەی لەگەڵ بکەم. خانمەکەم وتی:

- پووری گیان، کەمانی چاک لێ دەدا.

- ئۆو، براڤۆ، ئافەرین.

بۆ شایەتی ئەو ساتەش، کەمانەکەم لە بن دەستما بوو. کە میکایلا تاریفی منی کرد، پیاو و ئافرەت دەستیان کرد بە سەیرکردنی من. تا ئەو حەلە وایانزانیبوو لەو دۆمانەم کە بە دەرکانەوە کەمان لێ دەدەن. چونکە پانتۆڵێکم لە پێدا بوو کە

سەرئەژنۆکانی سێ جار پینە لەسەر پینە، پینە کرابوون. هێشتاش ڕیتاڵی گاجووتەکانی پێوە بوو. چاکەتێکی کورتم لەبەردابوو بە خۆیشم نەمدەزانی ئەسڵی ڕەنگەکەی چییە. چونکە بە کۆنی کە کڕیبووم، ڕەنگەکەی دیار نەبوو.

پۆستاڵەکانم ناڵچەیەکی پان و پەنجەی پێم لە لووتەکانیانەوە دەرچووبوو، شەبقەکەیشم ئەوەندە کون کون بوو، کە پەنجەی دەستم چوو بە کونێکیانا. باوەڕم پێ بکەن، ئەو سایە خانمەکەیشم کە ورد بووەوە ئەم هەموو کەسانە وا تەماشام دەکەن، ئەو لە من زیاتر تەریق بووەوە. وتی: «ئالفرێد ئەفەندی، تا جێت نیشان دەدەم، وەستا قاڕوون میوانداریت دەکا، فەرموو لای ئەو.» ڕوانیم زەلامێکی کەڵەگەتی تەنگئەستووری سمێڵزەرد پێشم کەوت. ناچار دوای کەوتم و چووینە دایرەیەک کە چوار هۆدە ئەمبەر و ئەوبەری پڕ فەرش، مێز و سوراحی و هەموو شتێکیان تیابوو. توومەز ئەمە دائیرەی باخەوانە. وتم: «ئینسان باخەوانی شاتوو بێ.» ئەو شەوە تێر نووستم، بەیانی لە خەو هەستام و کچە کارەکەرێکی جوان و نازدار، بە لەنجەولار هات. بوخچەیەکی ئاوریشمی لەبن باخەڵا بوو، وتی: «خانم بۆی ناردووی.» جارێ جلم لە بیر چووبووەوە، غەشیمانە لێم پرسی: «تووخوا تۆ ئیسمی شەریفت چییە؟»

- بەرتای کارەکەرت.

ئامان چەندە زمانی شیرین بوو، خۆیشی چەندی لێ دەهات. بەڵام من کە دڵم لای خانمەکەی خۆم بێت، ئەمانە بۆ مەزە تەماشا دەکەم، چاو پیاخشاندنە. کە ڕۆیی، بوخچەکەم کردەوە

و دەستێ جلی ئەفەندیانەی تیابوو، لەبەرم کردن. ئەمما نازانم چۆنم لەبەر کردووە، ئێواری دیسان عەینی کچ هاتەوە و وتی: «مادموازێل چاوەڕێتە، فەرموو.»

هەڵسام چووم، بە ناو باخچەدا قەیری ڕۆییم و گەیمە دائیرەی شاتوو. سەرکەوتم و خانمەکەم لە بەردەرگا چاوەڕوانم بوو، وا تێگەیشتم، بۆیە خۆی چاوەڕوانی دەکرد، تا سەهویەک نەکەم. بەخێرهاتنی کردم و چووینە ژوورەوە و تەقدیمی کردم، چاکبوو نەیانناسیمەوە. ئافەرین، کۆستۆمی تازە «لە هەموو شوێنێ کەوا بخۆیە» سێ ژن و پیاوێک لەوێ بوون، یەکێکیان سارینای تەڕپیر، دووەم پووری خانمەکەم، ئەویتریشم نەناسی. پیاوەکەش مێردی پووری میکایلا بوو، پیرەمێردێکی ڕیشسپیی نوورانی - زوج الكبير- پیاوەکە بە ڕوویەکی مەردانەوە بەخێرهاتن و خۆش و چلۆنییەکی گەرمی کرد. هەندێکی پێچوو سەری نایە بناگوێی ژنەکەی و بە گوێیا سرپاند و ئیشارەتێکی کرد. یەکسەر چووە دەرێ و هاتەوە و سینییەکی زێڕی بەدەستەوە بوو، تا مرەبا بۆ من بێنێ. ڕوانیم لەسەر سینییەی زێڕ قاپێ مرەبا و لە پیاڵەیەکدا چوار پێنج کەوچکی شیرینی و لە پیاڵەیەکی تردا تەنها ئاوی تیایە، دەمزانی ئەم کەوچکانە هەمووی بۆ من، بۆ ئەوە دانراوە کە بە هەر کەوچکێکیان و جارێک مرەبایەک بخۆم. کەوچکەکانم بە جارێ هەموو گرت بە دەستەوە و یەکە بە یەکە لە مرەباکەم هەڵدەدان. کەچی دیسان لە هەموو جێیەک، قاقای تەڕپیر پەیدا بووەوە. ئەم پێکەنینە من دەکا بە کەری نیوەزەڕ.

کەوچکەکانم دانایەوە و نەمخوراد. میکایلا وتی: «قەیناکا، تا دەتوانی بخۆ.» منیش وتم: «حەز لە شیرینیی ناکەم.» ئینجا

پیاوە گەورە ڕیشسپییەکە لێی پرسیم: «دەزانی بنووسی و بخوێنیتەوە؟» وتم: «بەڵێ.»

وتی: « لە دەوری شاتوو و لەسەر جادەکە دائیرەیەک هەیە، ئەوە دائیرەی گومرگی ئێمەیە. مەئموورێکمان هەبوو بە ناوی *باباتوم*، یانزە ساڵ مەئمووری گومرگ بوو و لەم چەند ڕۆژەدا مرد. دەگەڕێن مەئموورێک بۆ شوێنەکەی بدۆزنەوە، ئەوەتا تۆ هاتی، تۆمان لە جێگای ئەو دانا. وتوومە تا دائیرەکەت بۆ پاکەوە کەن. فەرموو لەگەڵ ئەو پیاوە *بابا* پیەر، بچۆرە دائیرەی خۆت.»

پیەر پێشم کەوت و من لە دواوە، دەرگای دائیرەی بۆ کردمەوە. لەسەر ساڵۆنێک دوو هۆدە بەرامبەری یەک هەبوون، هۆدەکان هەموو پڕفەرش، مۆبیلەی جوان و مێز و ئاوێنە و تاقمی توالێت و یازیخانەیەکی دروست و شیکیان تیابوو، ئەسکەملێکی فرفرۆکەییش کە لەسەری دادەنیشتی و بە هەموو لایەکەدا دەتتوانی بسووڕێیتەوە.

لەسەر ئەسکەملەکە دانیشتم، لە کورسی نیابەت خۆشتر و هەمیشەییتر بوو، بەملادا سووڕامەوە، بەولادا سووڕامەوە و بانگم کرد: «بابە وەرە سەیری کوڕە نابەکارەکەت کە دەتوت نابی بە هیچ. جاری هێشتا ئەمە ئەوەڵمانە، ئی فرەیشی ها لە ماڵ»

سەیری قەید و قیودی باباتومم کرد «فڵان عەرابانەزەخیرە لە فڵان جێگاوە هات و چوو بۆ فڵان جێ» ئەمەندە ڕەسمی وەرگیرا. ئەمە مادەی قەید و قیودی بوو، بەڵام تەرتیبی هۆدە

و یازیخانەی گوێز و لامپا و سوراحی و مێزی ئەلمۆدەی زۆر ڕێک بوو.

تەماشـام کـرد دۆڵابێکـی قەددیـواری لێـیە، کە کـردمەوە بـوخچەیەکی گەورە و لەنـاو بـوخچەکەدا دشداشـەیەکی ئاوریشـمی سپی «ڕۆب دوشـامبەر» هەبـوو. ئـوربەی هـۆدە یەعنی لبادی ماڵەوە و جووتێ سۆلی چنراو.

بە فرسـەتم زانـی دەسـتبەجێ ئەمـانەم لەبەر کـرد و شـەو کـڵاوم نـایە سـەر «تـاقبە». تەماشـام کـرد تەقـویمێکیش بە دیـوارەکەوەیە و ڕوانـیم بە پێـی ئەو تەقـیمە ٢٨ـی کـانوونی یەکەمە. وتم وا ئەمە تەواو دەبێ، دواتر بە مەرەکەبی شین بە دیـوارەکەوە بـۆ خـۆم تەقـویم دەنووسـم. بەڵام بیسـتبووم لە کانوونی یەکەمدا بەفر و باران دەبێت، کەچـی هەمـوو ڕۆژێ هەوا خۆشـە. وامزانـی لێـرە لە کانوونـدا بـاران نابـارێ، لەو ڕۆژەوەی کە لە ماڵ هاتبووم، نەمپرسیبوو چەندی مانگە.

لەم خەیـاڵانەدا بـووم، وتـم جـارێ بـا سـەبیلێ تـێکەم لەو تـووتنەی مۆرینـۆ کە دزیبـووم. سـەبیلێکم تێکـرد و هێشـتا تووتنەکەم هەڵنەگرتبوو یەکێ تەق تەق بە پەنجە لە دەرگاکەی دا و منیش لەبەرخۆمەوە وتـم: « *ئانتره*، وەرە ژوورەوە.» کە هـاتە ژوورێ کێ بێ چاکە؟ مۆرینۆ. لە دڵـی خۆمـا وتـم ئـاه، وەڵڵا ئێستە تووتنەکەی خۆی دەناسێتەوە. هەروایش بـوو، کە هـاتە ژوورەوە وتـی: «ئەوە لە تـووتنەکەی مـن سـەبیل دەکێشی.» وتم: «تووتنەکەی تۆ لە کوێ بووە؟»

- زاواکەی خانم دایمێ.

- زاوای خانم تووتن ناکێشێ.

- مۆرینۆ، لێرەش سەرم بە ڕەحەت ناهێڵی.

- ئای ئای وا زوو لە خۆی بایی بووی، ئەگەر باوکی خۆت نەدیایە، نەتدەزانی کوڕی کێیت، دەتوت کوڕی سیفندەبە. هەڵسم پانتۆڵە دڕاوەککەت بخەمە بەردەمت.

لەسەر ئەمە تووڕە بووم، ئەو ڕۆیی و ڕاکشام یەکێکی تر لە دەرگای دا. لە قینی مۆرینۆ وەڵامم نەدایەوە، گوێم لێ بوو وتی: «نوستووە با بچم بە خانم بڵێم نوستووە.» بە دەنگیا ناسیمەوە بەرتایە، جا بانگم کرد: «ئامان نەتکردبێ وا دێم.» گەڕایەوە و وتی: «مادموازێل دەفەرموێ تەشریفی بێ بۆ نانخواردن.»

منیش لە خۆشیانا هەڵسام هاتمە دەرێ، تەماشایەکی سەیری کرد تاقیە و پێم ترلگی چنراو، دەمی خۆی ئاخنی. بەڵام لە زگیا قوڵپی هەڵئەدا. پێشم کەوت و ڕایکردە سەرێ، کە چووم بۆ سەرێ بۆ سالۆنی شاتوو، جارێ لە چێشتخانە سەرقژنە سەریان لێ دەهێنامە دەرێ و پێدەکەنین و بە سینی دەفیان لێ دەدا. دەمزانی کارنوالی کریسمسە، زاتەن تەقویمەکەش ئەو ڕۆژە بوو.

لەوێ تێپەڕیم و خزمەتکار لەمبەر و لەوبەر ئەحیلکانەوە و سەرم سوڕمابوو.

هێجگار کە سەرم کرد بە هۆدەدا. یەکەم گوڕ سارینا دیتمی، بڕایەوە و ئینجا بە پێکەنینەوە هەڵسا کردی بە قیامەت. تێفکریم خانمەکەی منیش کە تا ئێستا پێم پێنەکەنیوە ئەویش دەکوڵێ. لە هەموو لایەکەوە لێم کەوتنە گاڵە، منیش هیچم پێ نەما و گەڕامەوە. هەرچەند مێردی پوورەکەی بانگی کردم،

نەگەڕامەوە. هاتمەوە هۆدەکەی خۆم و تێفکریم، بەرتا هات و وتی: «خانم دەفەرموێ جلێ لەبەر کا و بێت نان دەخۆین، لەسەری ڕاوەستاوین.» نیازم بوو نەچم، بەڵام بێ ئەمری خانمم پێ ناکرێ. ناچار هەڵسام چووم لە ڕێ تووشی مۆرینۆ هاتم، وتی: «تووخوا ڕاست دەکەن دەڵێن بە جلی کەرنەواڵی مەسخەرەیی کریسمسییەوە چوویتەتە سەر سفرە؟»

- چی بکەم، نەشارەزا بووم.

- ئەوە خوای من گرتتی، توونتیشت لێ دزیم و دەریشت کردم.

- ئینجا هەر ئەمەمان پێ دەویست، تووخوا تۆش برینم بکولێنەوە.

- نەخێر، ئەوە گاڵتەمان لەگەڵ کردی، کەسمان ئادابی خزمەتمان لە سکی دایکمان دەرنەهێناوە. دەفەرموو سەرکەوە، سەرکەوە تۆ ئەمەندە دڵساف بیت، دوایی بە ڕۆژی خۆت دەگەی.

سەرکەتم، ئەمما چ سەرکەوتنێک، دڵم لە مستما بوو و ئەگەر کارەکەرێ لەو کاتەدا خوویەکی لێ بکردمایە، بە لادا دەهاتم. سەرم کرد بە هۆدەدا و پێویست ناکات من بۆتان بگێڕمەوە، خۆتان ئیتر تێگەیشتوون کە تەڕپیڕ و قاقاکانی لێم بوون بە ماری قەە قەە. ئەمجارە خانمەکەم نەهاتە پێکەنین، فەرمووی:

- فەرموو ئەفەندی.

- زۆر سوپاسی تۆ دەکەم.

دانیشتم، ئەمما بە شەرمەوە. زاواکەی خانمەکەم چاک و چۆنی لەگەڵ کردم و وەڵامم دایەوە و وتی: «با ئەمڕۆ قەیدی بکەین کە دەستت بە ئیش کردووە.» ڕووی کردە کارەکەرەکە و وتی:

- بەرتا، ئەمڕۆ چەندی مانگە؟

من لە پێش بەرتادا وەڵامم دایەوە و وتم:

- ئەمڕۆ ٢٨ی کانوونی یەکەمە.

- چۆن ٢٨ی کانوون؟ بۆ چ ساڵ دەگەڕێتەوە؟

- ئەفەندیم، تەقویمی هۆدەکەی من وا دەنوێنێ.

دیسان تەڕپیری دوابڕاو پێکەنینەکەی لەدەستیابوو، دایە قاقا و خانمەکەم وتی:

- ئالفرێدە ئەفەندی، ئەوە تەقویمی پارە.

ئینجا بەرتا وتی:

- ئەمڕۆ ٣ی ئۆغۆستسە.

منیش وتم:

- عەفوو دەفەرموون، کەواتە منیش با تەقویمەکەی خۆم ڕاست بکەمەوە.

- کام تەقویم؟

- لە دیوارە سپییەکە، بە مەرەکەبی شین تەقویمێکی چەسپاوم دروست کردووە.

- کوڕە نەتکردبێ! چۆن لە دیوار تەقویم دەکرێ؟

- بەخوا کردوومە و بڕاویشمەتەوە! کەواتە با بچم ڕەشی بکەمەوە.

- جاریٚ با نان بخۆین.

هەڵسایین چووینە سەر سفرە، لە سەرەوە زاوا ئەفەندی و وە لای ڕاستیەوە سارینا و پووری خانمەکەم و لای چەپەوە میکایلا و من دانیشتین. کە لە تەنیشت میکایلاوە دانیشتم، هەموو دەردێکم لە بیر چووەوە. ئاوا سەرم لیٚ بەرز کردەوە و بە پیٚ لە تەختەی فەرشی ژوورەکەم مەقامم لیٚ دەدا. سارینا لە سکی خۆیا ئەکولا، منیش هیچ خۆم تیٚ نەگەیاند. کاسەیەکی شۆربای زلیان هانی و هەر کەسەو کەوچکێک شۆربای تێکرد. بڕوا کە خواردم، ئەمەندە بەلەزەت بوو، کەوچکێکی تریشم تێکرد و ئەویشم خوارد. جاری سێیەم خەریکبوو قاپەکەم پڕ بکەمەوە، میکایلا بە دزییەوە دەستێکی تێوە ژەندم، جا بزانە چەند زیرەکم، وا تێگەیشتم کە دەڵیٚ: «دەی لە چاوی منت کەوتبیٚ، ئەوەندە بخۆ تا تەڕپیر شەق دەبات.» سا کەوچکم داهێنایەوە و میکایلا هەروا ناچار مایەوە، ئینجا بە زوبان وتی:

- ئالفرێدە فەندی، بە شۆربا خۆت تێر مەکە، شتی خۆش لە دواوەیە.

حەقیقەت دوای ئەوە گۆشت هات، ماسی هات، سەوزە هات، شیرینی هات، میوە ها، چی هات، چی هات! لێم بووە کوردەناموسی و ئەمەندەم خوارد، کەمەری پانتۆڵەکەم شەقەیەکی کرد و پچڕا. هیچ ئاشکرام نەکرد. کە هەستاین ئیتر بەند نەدەبووم، دەستێکم بە پانتۆڵەکەمەوە گرت و چوومە

هـۆدەکەی خـۆم. خـۆم لـێ خـاڵی کـردەوە و لێـی ڕاکشـام و نووستم. ڕووم نەهات جارێکی تر دیشداشەکەی باباتون لەبەر کەم. چونکە ئەو پەندەی بەسەر هێنابووم.

# فەسڵی سێهەم

بەیانی لە خەو خەبەرم بووەوە، مۆرینۆ هات و وتی:

- ئەرێ ئێوارە ئەو هەموو شۆربایەت کردە کوێ؟

- ئەرێ کردمە گۆڕی مردووی تۆ، تۆیش لێم بووی بە سارینا! با سارینات لێ مارە کەین.

- وست! مردووت مرێ، بەم قسانە سەری من و خۆیشت بە فەتەرات دەدەی. جارێ مەکە تا شاییەکە دەبینین.

- شایی چی؟

- حەی! سبەینێ شاییە و هەڵپەڕکێ، خۆت حازر بکە بزانم چ مەقامێک دەزانی؟

- سێ پایی باش دەزانم، ئەمما تووخوا بڵێ شایی کێیە، دڵم دەرپەڕی.

- دڵت بۆچی دەرپەڕێ! تۆ چیت لێ قەوماوە، شاییە و وەسەلام.

- تووخوا مۆرینۆ ئەگەر پێم نەڵێیت!

- کوڕە ئاخر بە تۆ چی، سبەینێ دەیزانی.

- چۆن؟ یانی من تا سبەینێ نەیزانم!

- تۆ بەتلاش دیاری، خۆت بگرە سبەینێ دەیزانی.

هەرچیم کرد بێهوودە بوو، بڕیارم دا هەرچۆنێ بێ دەبێ بیزانم.

هەتا ئێستا هیچ لەگەڵ چێشتکەرەکان نەدواوم، لەبەر ئەوەی من لەسەر سفرە لە تەنیشت خانمەکەمەوە دانیشتم، ئیتر چۆن بێزم دێ لە ئاشچی و ماشچی بدووم.

بەڵام ئەمڕۆ هۆم کەوتە ئەوان، ناچم بە میکایلا بڵێم: سبەینێ شوو بە کێ دەکەیت؟

ناچار چوومە لای چێشتکەرەکان، تێفکریم هەموو ئیشیان بەدەستەوەیە.

لە خۆمەوە وتم:

- خوا قوەتتان بدا.

- کارت ڕاست بێ.

هەروا لەبەرخۆیەوە ئەوەی وت و هیچ ئاوڕێکی لێ نەدامەوە، عەجایەب! من ئالفرێد مۆلەرم، دەزانن کام ئالفرێد مۆلەرە ئەفەندییە؟ ئەوەی کە لەسەر سفرە، لە تەنیشت میکایلا دانیشتووە، جا وەرە ئەم پیاوە بە و وا جوابت بدەنەوە. هەر تەواو قینم هەڵسا و وتم:

- وادیارە زۆر سەرتان قاڵە.

- بەڵێ.

- چییە دەعوەتییە؟

- بەڵێ.

- شاییه؟

- بەڵێ.

- شایی کێیه؟

- بەڵێ!

کێ شوو دەکا؟

- بەڵێ!

جا وەره جەنابی ئالفرید مۆلەر مەپچڕێ، چێشتکەریش گوێی لێ ناگرێ. خەبەرێکی ڕاستی نانێنه مشت.

نەختێ ڕووی خۆم لێ گرژ کردن و نیوه هەڕەشەیەک تێم خوڕین:

- نابێ شعورتان بێ، منم من، پێم بڵێن کێ شوو دەکا؟

- که نەزانین، له خۆمانەوه کێت بۆ بدەین به شوو؟

- ئەمه چ کەماڵێکه پیاو لەم شانۆیەدا بێ و له هیچ نەزانێت.

تێفکریم و چێشتکەر له من تووڕەتر وتی:

- خۆ تۆ هێشتا جێی کنگت گەرم نەبووه، چاوت له کێیه که ناتەوێ شوو بکا، وا دیاره پیاوێکی زۆر هەرزەچەنەی.

«ئاخ وا وەرمان گرت که وایه، هەرزه چەنه! ئەگەر ئێوەش هەرزەچەنه بن و له دەمتان بترازێ بڵێن ئەوا فلان شووی کرد، هەردوو لامان ڕزگارمان دەبێ.» که زانیم لەمانه هیچ هەڵناگیرێ هاتمه دەرێ. جا خزمەتچی هۆدەم دی، لەوم پرسی: «چی هەیه، چی نییه؟»

- جاریَ پیَم بلَیَ تۆ دەغلَت بە منەوە چییە، دوای ئەوە ئەگەر کەسیَ شوو بکا بە تۆ چی؟

ئەمیش نەغمەیەکی تر! ئەگەر ڕاستت دەویَ، زۆریش ناهەقیان نەبوو، بەلاَم هاوار من ئاگریَکم تیَ بەربووە و نانیشیَتەوە. سا خواو و ڕاستان بەرتا پەیدا بوو و بە ڕوویەکی خۆش و شیرینەوە ڕووی تیَ کرد و وتم:

- چۆنی، چاکی؟ بە کەیفی؟ لە کویَوە دییَت و بۆ کویَ دەچی؟

بەرتا قەت ئەمەندە خۆشیی و چلۆنی بە گەرمی نەدیبوو، ئاسایی وتی: سوپاست دەکەم، چاکم. دەچم هەندیَ فەرمان بە چیَشتکەرەکان دەدەم.

- ئیَ منیش لە شویَن ئەوە دەگەڕیَم، ئەمە چییە، دەلَیَن شایییە، کیَ دەعوەتە؟

- بەلَیَ هەردووکیانە.

- کیَ شوو دەکا؟

سا لەوەدا بوو قسەی لیَ دەرکیَشم، لە سەرەوە تیَیان خوڕی، وتیان ڕاکە. ئیتر خۆی نەگرت و ڕای کرد.

دە یارەبی! چ دەردیَ توووش بووم، لەوە دەترسم خانمەکەمم لەدەست دەر کەن، هەرچەند کە هەرچی ئەمە ببییەت بەقەد سارینا پیَ دەکەنیَ. من لە کویَ و پرینس لە کویَ، بەلاَم ئەوانەی هەقیقەت ببینن، دەلَیَن ئافرەتیَ کە بتوانیَ خۆی بەخیَو بکا، لە شویَن میَردیَ ناگەڕیَ تڕ و دەعیەی بەسەردا بنویَنیَ. بەلَکوو کەسیَکی دەویَ کە تەنیا بە

خۆشەویستیی ئەوەوە دنیا بنوێنێ و ڕۆحی خۆی بە دەورا بگێڕێ.

ڕاست من لەوانەم کە میکایلا لە دووی دەگەڕێ، جارێ بووم بە پیاوێ کە میکایلا خۆی ئەفەندیم پێ دەڵێ. ئەوەتا ئێستا وەزیفەشم هەیە، ئیتر چی؟ دەنووسم، دەخوێنمەوە، لە جوگرافیادا شارەزای وڵاتان بووبووم، ئەوەتا بە چاویشم دیم. هەبێ و نەبێ ئەمە ئەگبیری زاوای خانمەکەمە. خوا بۆی ناردوون، خەریکن شاییەکی عەنتیکە بکەن و هیچ کەس ناوی زاوا و بووک نەزانێ، تا شەو بانگم بکەن و بڵێن وا میکایلا خۆی تۆی پەسەند کردووە، ئەمشەو ئێوە بووک و زاوان. مەرامیان ئەوەیە بزانن من شامەرگ دەبم یان نا.

جا کەواتە با لە ئێستاوە من بە شیعر سوپاسنامەیەک بۆ مسیۆ ڕێک بخەم، با بچمە جێی خۆم دەینووسم. بیستوومە عەشق زۆر کەسی کردووە بە شاعیر، با منیش یەکێ بم لەوانە. هەر لەو ناوەڕاستی حەوشەدا، خولیای عەشق و شیعر کەوتە کەللەمەوە. سەرەکەم دامەزراند: شاتوو لەگەڵ شا، تۆ یەعنی تۆ شا! کەوابێ بڵێم بە پەنجەی بەخت ڕێم کەوتە شاتوو، نە، نە ڕێم نەکەوت، هێنامیانە شاتوو. ئەمەیش قەیتانێ لە ئەندازە سەر دەکا، بڵێین هاتمە شاتوو. ئای ئای، ئەگەر بڵێم هاتم، دەبێ وەک قەرەجە کەمانچەژەنەکان بە سوالکەریی هاتبم. ئۆف خوایە، شیعر لە کەمانلێدان زەحمەتترە. جارێ هێشتا یەکەم میسرەع بووەتە شیعر، خۆ قافیە لە وەزن گرانترە، بابە با شیعری تیا نەبێت!

هەروا بە زوبان بڵێم: «جەنابی سەروەر و پەنابەر، لە هەرچی پادشاهان و ئیمپراتۆر و قەڕاڵ و دەرەبەگیان هەیە، کەس نەیتوانیوە شتێکی وا گرانبەها و نایاب ببەخشێ. نە، نە، ئەمەش نەدەبوو، کەسێ چ ڕایەیەکی دەکەوێ خانمەکەی من ببەخشێ. نیهایەت ئەم زاتە ڕابەری و دەلالەت دەکا، با بڵێم بە دەلالەتی تۆ. ئەوە دەلالەتیشی دەڵاڵییە، قەیناکا وا ئەڵێم. لەو خەیاڵە خۆشەدا بووم، دەستێ بەر شانم کەوت، کە چاوم هەڵبڕی ڕوانیم وەستا پیەرە، وتی:

–ئەفەندی، ئەوە ئەوەندە لێرەدا وەستاوی چی لێک دەدەیتەوە؟ ئاخۆ ڕەمڵی چی دەهاوی، یان بیر لە بەستەی خۆش دەکەیتەوە تا سبەینێ لە شاییەکەدا بیڵێی.

– سوبحانەڵڵا دیسان هەر بەستە و نوقراتەکەیە، توخوا ئەگەر ڕاستم پێ نەڵێی بووک و زاوا کێن؟

– زۆرت نەماوە، سبەینێ تێ دەگەی.

دە ئەنجا وەرە شێت مەبە و مەدەرە کێوان. ئەمیش خۆ دەڵێ سبەینێ. کورە هەی سبەینێی هەمووتان بەشەڕ بێ، ئاخر نابێ یەکێکتان لە دەمتان بترازێ و ئەم تەلیسمە بشکێنن. سبەینێ و سبەینێ! هەموو ئەمەیان بە جارێ لەبەر کردووە. وتم: «وەستا پیەر، ئەوا دیارە سبەینێ شاییە، هەمووتان یەک ئاواز دەڵێن، لە هەرچی دەپرسم دەڵێ سبەینێ دەیزانی و بەوە منیان خستۆتە مەراقەوە. ئێ با سبەینێ نەبێ ئەمڕۆ بێ، چی دەبێ پێم بڵێن!؟

– کەسم نەدیوە وەک تۆ کە کارێ عایدی ئەو نەبێ، ئەوەندە لە بارەیەوە بکەوێتە جوستوجۆ، چیت لەمە داوە؟ خۆ من بۆ

ئەوە نەهاتووم پێت بڵێم شاییە، بۆ ئەوە هاتووم خەبەرت بەمێ کە عەرەبانەیەکی زەخیرە لە بەردەرگا وەستاوە، تەشریفت بێ ڕەسمی گومرگی لێ بستێنە.

کە ئەمەی وت، دەستبەجێ جدییەتییەکی وەزیفەم بۆ پەیدا بوو، یەڵڵا دایرەی خۆم. هەرچی موعامەلەیەکی هەبوو بڕیمەوە، جا لێی ڕاکشام و چوومەوە سەر وەزن و قافیەی شاتوو و شیعری سوپاسنامە. ئەم نەختە جدییەتەی وەزیفەکە، هەموو وەزن و قافیەکانی لە بیر بردبوومەوە. سەرلەنوێ چەند شیعرێکم ڕێک خستنەوە، تا ئێوارێ لە دەریای شیعردا بووم. ئێوارە بەرتا هات و وتی: «بانگت دەکەن.» بە پەلە پەل هەستام. کە چووم تێفکریم دیسان هەر ئەو چوار کەسەن: میکایلا و پووری و زاواکەی و تەڕپیری نازەنین. بە ئوسووڵ چووم دانیشتم هەموو خۆشی و چلۆنیان لەگەڵ کردم. دوای ئەوە مسیۆ وتی: «ئەوە سبەینێ شاییە، دیارە تۆیش ئیشتراک دەفەرموویت.»

وەک ئەوەی هیچم نەبیستبێ وتم:

- شایی چی؟

- ئای نەتزانیوە سبەی ئێوارە دەعوەتییە، شاییە، بالۆیە، هەڵپەڕکێیە؟

- بەڵێ بە چاوان.

لەولاوە خانمەکەم هەڵیدایێ و فەرمووی:

- هەڵبەت لە هەموو کەس زیاتر ئەو پێی خۆشە کە لەسەر شەرەفی من گۆرانی بڵێ، کەمان لێ بدا، هەڵپەڕێ و هەموو شت بکا.

چی چی بە شەرەفی میکایلاوە کەمان لێ بدەم، دەک نەژیم. میکایلا شوو بە بۆرەزەلامێکی بێگانە بکا و منیش کەمان لێدەم، دەک پەنجەی من و دەستی تەڕپیر هەڵوەرێ، ئەگەر من لە شایی میکایلادا کەمان لێ بدەم. تەمام بوو بیدرکێنم، خۆم ڕاگرت. بە دڵ ئەمەم وت، بەڵام بە زوبان هیچم نەوت. هەروا لە دڵی خۆما لێکم دایەوە کە زۆر شت هەن ئیسان بە خێر و خۆشیان دەزانێ، کەچی بۆی دەبنە شەڕ.

کاشکێ ملم بشکایە، یا جەردەکان بیانکوشتمایە و نەهاتمایەتە ئێرە. هەروا ئەمەم لێک دەدایەوە و زوبانم بەسترابوو، تا چووینە سەر سفرە قوڕگم گیرابوو و ئیشتیهام نەمابوو. هەروا بە زۆر چینەم دەکرد، تا هەڵساین و لە پەنایەکەوە خۆم گەیاندە خانمەکەم و پرسیم:

- زۆر زۆر تکا دەکەم پێم بڵێ ئەم شاییە هی کێیە و زاوا کێیە؟

بە پێکەنینەوە وتی:

- جارێ ڕاوەستە با سبەینێ بێ، ئەوسا تێدەگەی.

کە ئەمەی وت تاسێکم بەسەردا هات کە لەوێوە تەمام بوو بێمە دەر و تا پێم بڕ دەکا سەری خۆم هەڵگرم. میکایلا تێگەیی، پەلی گرتم و بردمیە ژوورەوە و ناچار دانیشتم. جەنابی مسیۆ حیکایەتێکی دەست پێکردبوو و هیچ نەمدەزانی

چی دەڵێ. هەر وەنەوزم دەدا تا درەنگێ، لەپڕ دەنگی بۆریەی عەرەبانەی پۆستە هات و کاغەزێکیان هێنا و دایانە دەست ئەفەنــدی و ئەویــش دای بە میکــایلا. خوێنــدییەوە و ئەمە نووسـرابوو: «لەبەر هەنـدێ شـت کە ڕووی داوە، لە پاشـاوە پێتــان ڕادەگەیەنــم کە ســبەینێ شــایی ڕێــک ناکەوێــت تــا هەفتەیەکی تر.»

کە ئەم کاغەزە خوێندرایەوە، هەموو پێیان ناخۆش بوو، من نەبـم. ئیتـر هەڵسـام هـاتمە هـۆدەکەی خـۆم و بە جـلەوە لێـی ڕاکشام و نووستم.

بەیانی بە تەقەی دەرگا خەبەرم بووەوە، لە دەرگایـان دا و کردمەوە، دیسان مۆرینۆ بوو:

- ئـۆو، سـبەی بەخێـر کەمــانچەژەن، بـۆچی وا درەنــگ خەبەرت بۆتەوە؟

- هـیچ ئیشـم نییە بۆ جەنـابی عەرەبـانەچی عەرز بکەم کە بۆچی درەنگ خەبەرم بۆتەوە!

- توورە مەبە نەکا پەشیمان ببیتەوە، چونکە دەڕۆم، بەڵکوو ئیتر یەکتری نەبینینەوە.

- بە ملی شکاوت بۆ کوێ دەڕۆی؟

- جەنـابم، لەسـەر خێر پووری میکایلا و مێردەکەی دەبەم بۆ ویانە.

- ویانە دوورە؟

- ئەرێ، قەدەرێ دوورە.

- ئەی خانم؟

- ئەو لێرە دەمێنێ.

- ئەی من.

- تۆیشت بە ناخێری گیانت لێرە پاسەوان دەبیت.

هەر کە وای وت، ڕاست بوومەوە و دەستم کردە ملی، وەختبوو لە خۆشیانا بیخنکێنم. لەمانەدا بووی بانگیان کردم، وتیان مسیۆ بانگت دەکا. کە چووم خۆیان حازر کردبوو و ئامادەی سەفەر بوون. وتی:

- جەنابی ئەلفرێد مۆلەر، ئەوا ئێمە دەڕۆین و ئەم شاتووە بە ئەمانەت بۆ تۆ بەجێ دێڵم، وریایی بە و سەرپەشتی بکەیت.

میکایلاش وتی:

- ئیتر ئەلفرێد ئەفەندی سەر بە خێزانەکەمانە، هەڵبەت بە کەیفی ئێوە خزمەت دەکا.

سەرتان نەیەشێنم ئەوان ڕۆیشتن و ڕەوانەمان کردن. کە گەڕاینەوە ووم کردە هۆدەکەی خۆم، خانمەکەم فەرمووی: «ئەوە چی دەکەی؟ بۆ کوێ مل دەنێی، ئیتر تۆ نابێ لێرە بنووی، دەبێ بێیتە لای ئێمە شەر ئاگاداریمان بکەی.» ئەی خوا تۆ هەر خواکەی دوێنێی، لە چ دەرد و خەفەتێکدا بووم و ئەوەتا ئیمڕۆ خانمەکەم هاتووە قۆڵم دەگرێ و دەمبا بۆ لای خۆی، چونکە زەریف باوەڕم نەدەکرد، دووبارە پرسیم:

- چیت فەرموو؟

- تا ئەفەندی زاوامان دێتەوە دەبێ تۆ بێیتە ژوورەوە و لەوێ بنووی.

- لە چ هۆدەیەک دەنووم؟

دیسان تەڕپیر و پێکەنین بەرامبەری یەک وەستان و وتی:

- مەرامت چییە ئەفەندی؟ هەڵبەت جێگایەکت پێ نیشان دەدەین، خۆ بەخێر ناتکەینە باخەڵی میکایلاوە.

هەروا لە شوێنی خۆم وشک بووم. زوبانم بەسترا و هیچم نەوت، میکایلا فەرمووی با بچینە سەرێ. سەرکەوتین و هۆدەیەکەی گەورەی لێبوو کە تەڕپیر و خانمەکەی تیایدا دەنووستن، لە تەنیشت ئەویشەوە هۆدەیەکی تری بچووکی لێبوو، بە منیان وت ئەوە هۆدەکەی تۆیە. «جارێ با بچین دانیشین، کە خەومان هات، تۆ دەچیتە ژووری خۆت.» چووین دانیشتین و من لە خۆمەوە وتم:

- ئای دیسان هەر سێ هاوڕێکەی سەفەرماینەوە، تەنها مۆرینۆمان کەمە.

هەروا بردمانە سەر تا ئێوارە. من لە ناوەڕاستی خانمەکەم و تەڕپیردا دانیشتبووم و شاییش پەکی کەوتبوو. ئیتر مەپرسە چەند بەدەماخ بووم، لووتم قەندیلی دەکێڵا. لە نان بووینەوە و دانیشتین تا وەختی نووستن هەر من قسەم دەکرد و تەڕپیر پێدەکەنی. وتم:

- خانمەکەم ئەگەر بە حساب بووایە، مادام سارینا پارەی زۆری دەکەوتە سەر. یەکەم: من قسەی بۆ دەکەم و ئەو پێدەکەنی، دەبووایە پارەی بدامایە. دووەم: ئێستە دەبینم

سارینا عەینەن مەکینەی پێکەنینە، ئەگەر ئەم مەکینەیە بە بەنزین بگەڕایەوە، ئەوا مەسرەفێکی زۆری دەبوو. بەرەکەتدا نە من پارەم دەوێ و نە ئەویش بەنزین.

خانمەکەم پێکەنی، سارینا وتی:

- سەیر کەن، «پەڵووڵە»یش دەم دەسووتێنێ.

ئینجا تێفکریم وادەی خەوە، هەڵسام و وتم: «شەوتان بەخێر، کە من نزیکتان بم هەڵبەت مەترسن، من جار جار سەرتان دەدەم.»

ئەمەم وت و هاتمە دەرێ، بەڵام تا گەیمە هۆدەکەی خۆم قاقای تەرپیر دەنگی دەدایەوە. ئیتر نووستم، بەیانی کە هەڵسام خۆم کۆکردەوە. یەکەوڕاست بە هۆدەکەی ئەواندا سەرم کرد بە ژوورا، ئەمجارە لە باتی پێکەنین سارینا بانگری کرد:

- وەحە، وەحە شتێ نەشکێنی.

- ئەمە مەعنای چییە؟

سارینا وتی:

- کوێری! چاوت نابینێ ئێمە هێشتا ڕووتین و خۆمان پۆشتە نەکردۆتەوە، ئینجا تەریق بوومەوە، هاتمەوە هۆدەکەی خۆم تا ئەوان هەڵسنا و خۆیان کۆکردەوە و ناردیان بە شوێنما. ئەمجارە کە چووم، لە پێشدا بە پەنجە لە دەرگام دا، مۆڵەتیان دام ئینجا چوومە ژوورەوە، سارینا وتی:

- بزانە نەقیزە چۆن فێری ئۆرتە و بەڕەی کردی؟

- من به نەقیزەیەک هاتمە ڕەت، ئاخۆ خەڵک چەند نەقیزەی خواردبێ!؟

قاوەڵتیمان کرد، تیفکریم خانمەکەم نەختێ ماتە، وتم: «ئارەزوو دەفەرمووی هەندێ کەمانت بۆ لێدەم.» فەرمووی باشە. چووم کەمانم هێنا خەریک بووم سازی بکەم، پۆستەچی هات کەغەزێکی بە ناوی میکایلاوە هێنا. وەرم گرت و وتم: «بۆت بخوێنمەوە؟» فەرمووی جارێ نا، با خۆم بیبینم. کاغەزەی بە زوبانی ئیتاڵی خوێندەوە و لەگەڵ تەڕپیردا قەدەرێ گفتوگۆیان کرد، پاش ئەوە، ڕووی کردە من و فەرمووی:

- ئای ئەلفرێد ئەفەندی، حاڵی دونیا وایە، ئەمجارەیش گوێمان لە دەنگی کەمانەکەت نەگرت، سبەینێ دەڕۆین.

- ئۆغر بێ!

- بۆ لای پوورم.

هەر ئەو ڕۆژە دوو عەرەبانە حازر کرا، خۆیان و دەست و پێوەندیان سوار بوون و بارگیرێکیشیان بۆ من هێنا و سواری بووم. دەبوو بە دوای عەرەبانەکاندا بە غار بڕۆم. ئەی خوا داد، لە شاتوو هاتینە دەرێ، دوو عەرەبانە لە پێشەوە بە لۆقە لێ دەخوڕن، منیش لە دوای ئەوانەوە، بە سواری و گورگەلۆقە ئاوزەنگی دەکووتم. چونکە کۆڵی سواردم و تا ئەمڕۆش خۆمان کەرێکیشمان نەبووە تا سواری بم، زۆر بە سەخڵەت ولاخم بۆ لێ دەخوڕرا. هێجگار کە دەیزانی من سوار نیم، بە هەوەسی خۆی نەبووایە نەدەڕۆیی. لەقەم لێ دەدا و هەڵی دەتیزاند، بە هەر حاڵێ بوو تا ئێوارە دوور و نزیک

عەرەبـــــانەکەم وەن نەکـــــرد. دەمەوئێـــــوارە زۆر دوور کەوتبـووونەوە، هەرچـۆنێ بـێ خـۆم گەیانـدە عەرەبـانەکە و هاوارم کرد: «وا تاریک داهات! ئەسپەکەم ناڕوا نەختێ هێواش لێخوڕن.» تەڕپیری نەگبەت لەو سەخڵەتییەشدا دیسـان پێکەنـی و وتی: «تۆ لەسەر خۆ وەرە.»

دەک تەڕپیر خوا لەناوت بـا، وتـم: «لەسـەر خـۆم لێخـوڕم، دوایی ئێوەم لێ ون دەبن، چی بکەم؟»

- تـــا دەتـــوانی لێخـــوڕە، کە دواکەوتـــی بە پرســـیار دەماندۆزیتەوە.

- لەم چۆڵ و هـۆڵییەدا لە کێ بپرسم، ڕێی دواوەش نـازانم تاکوو بگەڕێمەوە.

تێفکـریم سـارینا هەر دەیەوێ مـن دواکەوم، ئینجـا هـاوارم بردە خانمەکە و وتم:

- تۆ چارەیەک بدۆزەرەوە.

- من بڵێم چی؟

- سواری لای خۆتانم بکە.

- ئەگەر جێگا هەبووایە بۆچی سواری ولاخم دەکردی؟

- هیچ نەبێ یەکێ لە کچەکـان کە سـواریی دەزانـێ بـا بێـت سـواری ئەسـپەکەم ببـێ، مـن بچـمە جێـی ئەو. بیسـتوومە لە ئەورپـای «ئەمـازۆن» سـوارچاکی ژن هەن. بەڵکـوو بەرتـا سواریی چاک بزانێ، با بێت سوار بێ. هەموو بە جارێ دایانە قاقای پێکەنین.

خـۆ نـازانن مـن دڵـم چـۆن بـووە بە خـوێن، وا بە نەشـئە پێدەکەنن.

ئیتـر چـارم نەمـا، چـاوم پڕ بـوو لە گریـان. عەرەبانەکـانی ئەوانـیش تێـپەڕین، لە قینانـا هەر ئـاوزەنگیم لە بـارگیر دەدا، ئەویـش مـانی گرتبـوو، تـا چەقـۆکەم دەرهێنـا و کـردم بە پشتەملیا، لە تاوانا کەوتە چوارناڵە و منی فڕیدا و خۆی بۆی دەرچوو.

لەتـاو کەوتـن و ئـازاری سـەر و لەشـم، قەدەرێ بێهـۆش کەوتم، دوایی هاتمەوە هۆش تا هێزم تیا بوو بانگم کرد.

هـای خـانمەکە، هـای خـانمەکە بمـگەرێ. ئەوەتـا لێرە خـراپ کەوتـووم، تەنهـا ئەوەی دەمـوت، ئەو دەنـگ و بانـگ و هـاوارە لەناو چەم و چخورد و دارستاندا دەنگی دەدایەوە و هیچی تر.

دوای ئەم هاوار و بانگە، هیچ چارەم نەما. هەستام بەمـلا و بەولادا وەک هەروەڵەی حاجیـانی سـەفا و مەروەم دەکـرد. لە هیچ شوێنێکەوە بارگیر دیار نەبوو. جارێ دانیشتم و تێر و پڕ گریام، نەختێ بە گریانەکە کوڵ و کۆی دڵـم دامرکایەوە. ئینجا هەڵسام هەرچەندە لێکم دەدایەوە نەم دەزانی ڕوو بکەمە کوێ. وردە وردە جـوولام، لەبەرخـۆمەوە لـێکم دایەوە خـۆ ئێسـتا جارێ وا ڕابوورد، ئیتـر من نـاگەمە ئەوان، بـارگیریش سـەری خۆی هەڵگرت و ڕۆیشـت و جارێکی تـر بۆم نـادۆزرێتەوە، با جارێ بچمە سەر شەقام، ئەوجا بزانم ڕشووم لە کوێ دەبێت. چـــونکە بـــارگیرەکە وای هەڵگرتبـــووم و لە ڕێ دووری خستبوومەوە کە هاتمەوە سەر شەقامەڕێگە، نـاوی خـوام هێنا و لای دەستە ڕاستم گرتە پێش. چونکە لای ولاخی خۆمـان بە

پێخاوسی فێربووبووم، پۆتینەکانم داکەندن و نامنە بن باخەڵم و کەوتمە ڕێ. وردە وردە هۆشم هاتەوە بە خۆما و بیرم کردەوە یاران خۆ کە مۆرینۆ پوورەکەی میکایلای برد، من لێم پرسی بۆ کوێ دەچی؟ ئەو وتی دەیانبەم بۆ ویانە، وا دیارە ئەوانیش ڕۆییون بۆ ویانە، چوون من کە پرسیم ویانە دەدۆزمەوە، یائەڵلا و یا ویانەم کرد.

هەروا بەم خەیاڵاتەوە ڕۆیم، دوو سەعاتێکی پێ چوو ماندوو بووم زۆریشم برسی بوو، نایشزانم سەعات چەندە و شەوە. خوا و ڕاستان لە پێشەوە بینایەکی سێ قات دەرکەوت، وتم ئۆخ، هەڵبەت لەم سەر ڕێیە ئەمە هەبێ و نەبێ ئوتێلە.

نان دەخۆم و تا ڕۆژ دەبێتەوە لێی دەنووم. لە دەرگام دا و دەنگی پیرێژنێکی دەنگنێر پرسی:

- ئەوە کێیە؟

- من ئەلفرێد مۆلەر بەگ.

لێرەدا لە بیرم بوو کە جارێک پێیان وتبووم بەگ.

- های های بەگی کوێی؟

- بەگی ناو عەرەبانەکەی میکایلا.

- جارێ ئێرە جێی بەگ نییە و میکایلاش ناناسم، خوا دەزانێ بەگزادەی توونی حەمامی یان گیرفانبڕی، یا سەرسەریت، چیت؟ بڕۆ بە ڕێی خۆتدا.

- بابە خوا هەڵناگرێ، تۆیش لێم مەبە بە تەڕپیر.

لەگەڵم ڕێ نەدەکەوت. پێ بکەنە، بەڵام هیچ نەبێ دەرگام لێ بکەرەوە ماندووم! خرتە خرت خەریکی دەرگاکردنەوە بوو، تا دەرگای لێ کردمەوە ئاوی پێم داهات. کە دەرگەی کردەوە چی ببینم! تەرپیر ئەمەندە ئەستوور بوو دەتوت کەندووی نەزانکردووە، کەچەڵ، سوراوسپیاوکراو.

جارێ لە نووکی پێمەوە تا تەوقی سەرم لێم ورد بووەوە، پیایا هەڵم ڕوانی، ئینجا وتی: «جل و بەرگ و تەقبە و غراوانت تازە و جوانن، بەڵام وەک ئەوەی لە کەر پەڕیبی سەرتاپات تۆزە، ئەی پۆتینەکانت بۆ ناوەتە بن باخەڵت و بە پێخاوسی بە ڕێدا هاتووی، دیارە تازە پیاکەوتووی و فێری پۆتین نەبووی، کەوابێ ئەم جلانەیشت دزیوە.» وتم:

- نەخێر مادام، بەگێکم لەو بەگانەی خۆت دەیزانی، بەڵام لێم قەوماوە، جارێ با بچینە ژوورەوە بۆت دەگێڕمەوە.

- شەو لێرە دەمێنیتەوە؟

- ئەگەر دامکەیت و جێ و ڕێم بدەیتێ، هیچ کوێوە ناچم.

- منەتی تیا نییە ئەمە ئوتێلە، هەرکەس پارە بدا هەموو شتێکی دەست دەکەوێ.

لێکم دایەوە هەموو شتێک دەبێ چی بێ؟! جارێ نەمپەرژایە سەر مەعنا، پرسیم:

- شەوم چەندم لێ دەسێنی؟

- نووستن قرانێک، ئەگەر بە ئەندازەی سکت نانیش بخۆی ئەمە نیو ڕوپییە. بەڵام دەبێ لە پێشدا پارە دەرکەی، چونکە

زۆری وامــان دیــوە هــاتووە خــواردوویەتی و نووســتووە و پاشان وردەترِی بۆ دەورکردووینەوە.

- زۆر ئەســەف بــۆ تــۆ کە لە ڕووی ئەلفرێــد بەگــدا ئەم گوستاخچە دەکەی. من بەتەمام ببمە خاوەنی شاتوو و مۆرینۆ عەرەبانەچیم بێت. ئێستە تۆ لەسەر نیو ڕووپییە ڕشام دەگری.

کە وام وت، باوەڕی پێکردم و وتی: «فەرموو ژوورەوە.» لە قاپی چووینە ژوورەوە، حەوشێکی گەورە و دالانێکی پان و درێژ کە فەرشەکەی گڵ بوو، لێبوو. ئەسکەملی شکاو — لە ئەســکەملەکانی قەلەنــدەرخانە کــۆنتر و شــکاوتر بــوون- قووتــوولەیەکی نەوتــی ڕەش، گــۆزەیەکی کــۆنی دەمــکەل، پیالەیەکی ئاوی درزبردوو، لەگەڵ مێزی پێچکەشکاو و بڕێ داری سووتاندن درابووە بەر ئوتێل. ئەمە سەرەڕێیەکە بوو.

بەڵام دەسەلات چییە، لەسەر کورسی دانیام و وتی:

- ئینجا دەردی خۆت هەڵبژێرە.

- جارێ برسیمە، ورچی برسی یاری ناکات.

هەڵسا لە دەرگایەکی بچووکەوە چووە ژوورێ، کە هاتە دەرێ قاپێ ئاوی ئێسقانی کولاو، هەندێ کەلەرمی پیشاو، خەپلەیەکی نیوەبرژاو، ماسییەکی سلاموورەی گەنیوی هانی.

بەم لادێییەی خۆمەوە، دەستم بۆ هەرچییەکیان برد پەشیمان بوومەوە. خەپلەکەش پاروویەکم لێ خوارد و بۆم قووت نەدەدرا، ئاوە گەرمەکەم کرد بە سەریا. بە هەزار نزگەرە بۆم قووت نەدەدرا. هەرچۆنێ بێ ئاگیرم کرد، هێشتا نەهاتبوومەوە ئەوەی تێر دانیشم، هێواش هێواش بە پەلەپیتکە

لە دەرگـا درا. تەڕپیـر وەک کـێچ ڕاپەڕی و دەرگـای کـردەوە، دوو بەدشکڵی جەهەننەمی هاتنە ژوورەوە، نـوور لە چاوانیاندا نەبوو. من لە ترسا دەلەرزیم، یەکێکیان وتی:

- ئەم کابرایە کێیە؟

نەمهێشـت و بەر لە مـادام من جوابم دایەوە وتـم خۆمـانین. وتی:

- چۆن خۆمانی؟ تۆش لە یارانی، یەعنی لە ئێمەی؟

- بەڵێ.

- کەوابـوو خـۆت گـورج کە، شـکارێکی باشـمان لە پێشـە بـا بۆی بچین.

لە حەیبەتا لەرزیم، وتم:

- مـن لە یـاران نـیم و بە عـومری خـۆم میشـکم ئـاوەڕووت نەکردووە.

ئینجا ڕەفیقەکەی هەڵی دایە و وتی:

- کەوابوو ئیشت چییە لێرە؟

- ڕێبوارم، ڕێم لێ گۆڕابوو و خۆم کووتایە ئێرە.

ئینجـا سـەری نـایە بنـاگوێی ئـافرەتە تـوتێلچییەکە، بە سـرتە هەندێ ورتەیان کرد و ڕووی کردە من و وتی:

- ئێ ئێ، تۆ جاسووسی و لە پێ و شوێنی ئێمە دەگەڕێیت؟

- کورە پیاوەتیتان بێ، من ئەلفرێد ئەفەندیم.

- ئێستا ئەفەندێتیت نیشان دەدەم، خاتە! دەرگای ژێر زەمینەکە بکەرەوە.

خاتە ناوی ئوتێلچییەکە بوو. دەرگای ژێرزەمینیان کردەوە و منیان لە پێپلیکانەی ژێرزەمینە فڕێدایە خوارەوە. سەرەڕای ئەوەش، خاتە بانگی کرد: «ئەوێ کووپەی تیایە، نەخەڵەتابی لێی بخۆیتەوە.» من ترپ کەوتمە خوارەوە و خاتە دەرگای لەسەر داخستم. لە کەوتنەخوارەوەدا سەرسام بووبووم، ژێرزەمینیش ئەوەندە تەڕ بوو کە شتێ کاری لە هەموو ئەندامانم کرد. گەڕام بۆ شتێ لەسەری ڕاکشێم، هیچ نەبوو. لەسەر کووپەیەک شەراب دانیشتم، لێکم دەدایە کە چیم بەسەر هات. کە گوێم گرت لە سەرێ هەرایە، لە کونێکەوە ڕوانیم جەردەکان بوون بە سیان و ئافرەتێکیشیان لە ناودایە. هەرسێکیان لێی دەدەن، یەکێکیان خەنجەری هەڵکێشا و نایە سەر سنگی و وتی: هەر دەتکوژم، ڕاست بڵێ ڕوویان کردە کوێ؟ ئافرەت لە ترسا شتێکی وت، بەڵام باش گوێم لێ نەبوو. جەردەکان وتیان با ئەم ئافرەتە لێرەبێ، وا ئێمە دەچین بە شوێنیانا، ئەگەر ئەمە درۆی کرد، ئەوا دێینەوە و دەیکوژین. خاتە ئەمیش بکەرە ژێرزەمینەکە. خاتە وتی: «ژێرزەمینەکە پیاوی تیایە.» وتیان قەیناکە.

خاتە وتی کوڕەکەی ژێرزەمینەکە وەک بێدەسەلات وایە، با ئەو ببەمە قاتی سەرێ. «بەڵێ چونکە ئەو کوڕە لووسە، دەتەوێ بیکەیتە باخەڵی خۆت.» خاتە پێکەنی و وتی: «کەوابێ هەردووکیان ئەکەمە نهۆمی سێیەم.» منی هێنایە دەرێ و لەگەڵ ئافرەتەکە کردینیە هۆدەی سەرێ، کە سەرکەوتین و دەرگای لێ داخستین، چرایشمان نەبوو و بە پەلەکوتێ

قەنەفەیەکم دۆزییەوە، لەگەڵ ئافرەت لەسەری دانیشتین. لێم پرسی: «تۆ چۆن تووشی ئەمانە هاتی؟»

وتی:

- مەپرسە، من لادێیم، شەو لەسەر خەرمان دەهاتمەوە تووشی ئەمانە بووم. وتیان دوو عەرەبانە لێرە تێپەڕین ڕوویان کردە کوێ؟

پێم وتن: «نازانم. لەسەر ئەوە گرتمیان و هێنامیانە ئێرە. لێرە وەخت بوو بمکوژن. ناچار وتم ڕوویان کردە دێی ئێمە، وا چوون بە شوێنیانا.»

- ئای دەخیل و ئامان، جا بە ڕاست تۆ دوو عەرەبانەت دیبوو؟

- بەڵێ، دوو عەرەبانە لای خەرمانەکەی ئێمەوە تێپەڕین، ئافرەتیان تیابوو.

- ئەی نەتکردبێ شوێنی میکایلات پێ گوتبن. هەر ئێستا شوێنیان دەکەوم، سیان نەبن شەش بن، وەک کارە کۆرپە هەر شەشیان سەر دەبڕم. چۆن دەوێرن بچنە سەر ڕێی خانمەکەم. هۆ دایکتان وا و باوکتان وا، خۆتان ڕاگرن ڕا مەکەن وا بۆتان هاتم.

ئیتر بێ ویستانە بە هۆدەکەدا ڕام دەکرد و دەم نەڕاند و پەلاماری جەردەم دەدا، شێت بووبووم. ئافرەتەی قوڕبەسەر لە ترسا دانەچۆقەی پێکەوت. دەلەرزی و وایزانی شێتم، هاواری کرد ئای لە ڕێی خوادا مەمکوژە من چووزانم عەرەبانە خانمی تۆی تیا بووە.

ئینجا پەنجەرەم هەڵدایەوە و ڕوانیمە خوارێ. سێ نهۆم بەرزە و ئێمە لە قاتی سێیەمداین. گەڕام گوریسێ پەیدا بکەم پێی بچمە خوارێ، نەبوو. هاتم بەرگی قەنەفەکەم پارچەپارچە کرد و پێکمەوە بەستن. وەک گوریس دام هێشتە خوارێ و سەرێکم بەست بە پەنجەرەکەوە، خەریک بووم خۆم داهێڵم، ئافرەت وتی: «بەخوا ئەگەر لە پێشدا من دانەهێڵی، خەبەرت لێ دەدەم.» ناچار لە پێشدا ئەوم داهێشتە خوارێ، لەگەڵ پێی ناوی زەوی، فڕکەیەکی کرد و وتی: «خاڵۆ تۆ جێت خۆشە، دانیشە تا دزەکان دێنەوە، جوابی منیشیان بدەرێ و بڵێ دەربازی بوو.»

وتم: «حەقتە! شەرتی دنیایی کە بە تەنها لە هۆدەیەکی تاریکدا پێویست بوو بەجێی بێنم قورسم کرد، تۆیش زۆر چاکت کرد، کە لەسەرم ڕانەوەستای و بەجێت هێشتم.»

دووبارە خەریک بوو خۆم دەرباز بکەم، یەکێ لە دەرگای دا، خاتە بوو. وتی چۆنیت، ناڕەحەت نیت. وتم: چاوکم. وتی ئافرەتە چی دەکا؟ وتم نوستووە. وتی سا کەواتە با من بێمە لات، وتم زۆر نەخۆشم توانای دانیشتنم نییە، جوابم دا و ڕۆیی. ئینجا هەڵسام منیش خۆم داهێشتە خوارێ، نزیک پەنجەرەی قاتی زەمینی کەوتم و لە دیوارەکە هەڵبەزیمەوە. دوور کەوتمەوە و کە دام بە پەنجەرەدا هاڕەی کرد. شووشە تێک شکا، توومەز جەردەکان هاتبوونەوە، ڕایان کرد و هاتن دایان گرتم، خا قەدەرێکیان لێدام. وتیان خەریک بووی ڕاکەی، لە شوێن ئافرەتەکە گەڕان، زانیان ڕای کردووە و کەوتنە تەلاشێ. منیان خستەوە ژێرزەمینەکە و گوریسێکیان هێنا توند توند شەتەکیان دام و بەستمیان بە کووپەی شەرابەوە.

زۆر ناڕەحەت بووم. هەرچۆنێک بوو قۆڵی خۆم کردەوە، جا سەری کووپەی شەرابم لادا و بە مست خواردمەوە و مەست بووم. کردمە گۆرانی و بەزم. خاتە هات وتی: « ئەوە چی دەکەی؟» وتم: «ئەی شایی من و تۆ نییە؟ ئەوەتا گۆرانی دەڵێم.» خاتە پێکەنی، چوو چرایەکی هێنا وتی با بتکەمەوە، کە تێفکری نەبەستراوم، وتم مەترسە من نابەسترێم. بە هەزار ئاین و ئۆین بە دەمیەوە پێکەنیم، تا بردمیە ژوورەکەی خۆی کە لە خوارەوە بوو و پەنجەرەکەی بەسەر کۆڵاندا دەیڕوانی. دەمتوانی لەوێوە باز بدەمە کۆڵان. کە چووینە ژوورەوە وتم: «توخوا زۆر کڵۆڵم، با نەختێ بنووین.» ڕاکشاین و ئەوم خەواند، جا هەڵسام و چووم بە لای پەنجەرەوە وتم نزمە لەوێوە باز دەدەمە خوارێ. شەو تاریک بوو و شووشەی پەنجەرەکەیش پاک، وامزانی شووشەی پێوە نییە، سا سەرم کرد بە پەنجەرەدا و شەققەم لێ هەڵسا. توومەز شووشەی پێوە بووە، بە جارێ شووشە وردوخاش بوو و سەری منیش شکا. خاتە ڕاپەڕی و وتی ئەوە دیسان نیازت بوو ڕا بکەی، سا ڕاوەستە بۆم. بەخوا ئیتر نەمکردە نامەردی، تا ئەو کەوتە خۆ، من هەر لەو پەنجەرەیەوە بازم دایە خوارێ و بانگم کرد: «خوا بتگرێ، ئەگەر بە سەربەستی بەری دامایە پارەی هەموو شتێکم دەدایتێ و لە باخەڵیشتا دەنووستم. ئێستە من و پارەکەیشت لە کیس چوو.» ئەوەم وت و ئەو کردیە قیژە و هاوار های بیگرن دزە، منیش تا تیاما بوو ڕامکرد. نیو سەعاتێ ڕامکرد، جا چوومە دارستانێک و لام دا و دانیشتم. هەندێ حەسامەوە، هەر ئەوەندەم زانی ترپەی پێ پەیدا بوو. لە ترسانا چوومە سەر دارێک، هێشتا تەواو خۆم نەشاردبووەوە،

دوو زەلام پەیدا بوون، بانگیان کرد: «تارمایی سەردار دێوی، درنجی، ئادەمیزادی چیت؟» وتم :«کرمی دارم.» قەدەری پێکەنین.

بە پێکەنینەکەیاندا تێگەیشتم کە جەردەکانی لای خاتە نین، زۆر خۆشحاڵ بووم، وتم: «کارتان ڕاست بێت کە ئەوان نین.» وتیان: «کێ نین؟» وتم: «جەردەکانی مەڕ خاتە.» نیوەسەرگوزەشتەیەکی خۆمم بۆ گێڕانەوە، بەزەییان پیاما هات و وتیان دەوەرە خوارێ بڕۆ، خوا ئاگادارت بێ. دیسان کەوتمە ڕێ، پێڵاوەکانم لە ئوتێلی خاتە بەجێ مابوون، بە پێخاوسی ملی ڕێم گرت. ماندوو و مردوو، کەمانەکەیشم کە کەوتمە خوارێ شکا، نەمدەزانی بە چی دڵخۆشیی خۆم بدەمەوە؟ سا زۆر ڕۆیم کەم ڕۆیم نازانم! دەنگی کەڵەشێر هاتە گوێم. ئەگەر ئێوەش وا لێتان قەومابێ و ڕێتان ونکردبێ و لەپڕ دەنگی کەڵەشێرتان بیستبێ دەزانن چەند خۆش و مژدەدەرە. گەییمە بەر و ڕوانیم دێیەکی چل پەنجا ماڵییە، وتم ڕەنگە لەم دێیە هەواڵی میکایلا بزانم. ڕووم کردە دێ و هەر ئەوەندەم زانی زەلامێ بە تفەنگێکی درێژەوە بەرەو پیرم هات. لوولەی تفەنگی ئاراستە کردم و وتی: «دەست هەڵبڕە.» دەستم هەڵبڕی و وتم: «چییە؟» وتی: «بەم شەوە و بەم قیافەتەوە چی دەکەی لەم دەورە؟» وتم: «بەیانییە ئەمەندە تاریک نییە، تۆ ئەلفرێد مۆلەر ئەفەندی ناناسی، ئەلفرێد مۆلەر ئەفەندی مەڕ میکایلا، ئەها میکایلای شاتووەکە کە تەڕپیری لێبوو!» کابرا واقی وڕما و وتی: «شاتوو چییە، لێرە شاتوو هەیە بەر ئەگرێت، ئەمما شاتوو ناناسین، تۆ بەم سەروسیما سواڵکەرانەتەوە چۆن دەبی بە ئەفەندی؟»

«چی بکەم، پێری بتدیمایە چ کوڕێ بووم، ئەمشەو کە لەژێر زەمیندا حەپسیان کردم و لە پەنجەرەوە خۆم فڕێدایە خوارەوە، لە خۆڵدا گەوزام و چاکەتەکەم دڕا و وام لێهات. ئێستا تۆ هەرچۆنێ بێ چارەی دەستێ جلم بۆ بکە، ئینجا دەمناسی.»

«جاری ئەم دێیە خەیاتی تیا نییە، باوەجوو تۆش پارەت نییە ئەگەر پارەت ببێ من دەستێ جلت بۆ پەیدا دەکەم.»

«بۆ پارە پەکم ناکەوێ.»

کە وتم پارەم هەیە پێشم کەوت و چووینە دێ. ئەمە خۆی حەسحەسی ئەو دێیە بوو و منی بردە ماڵی خۆیان. لە دەرگای دا و ژنەکەی دەرگای کردەوە. بە ژنەکەی وت دەی بچۆ جلەکانم بێنە با بیانفرۆشم بەم پیاوە. ژنەکەی چوو سەبەتەیەکی هێنا، گوونییەکی بە سەردا درابوو، هەڵی پچڕی و پانتۆڵێکی ڕەشی کورت، چاکەتێکی شینی ژاندرمەی و منتانێکی قاوەیی تێدا بوو. ژنە وتی: «کەس جلی وای نەبووە، ئەمە دە جەژنی دیوە، بەشێ دەی تریش دەکات. ئەگەر بە من بێ نایەڵم مێردەکەم بیانفرۆشێ، چونکە زۆری لی دێن و پێوەیان جوانە.» سەرتان نەیەشێنم ژنە بە زمانلووسیی ئەو جلە کۆنانەی بەسەردا بڕیم. بە دوو لیرە و جلە تازەکانی خۆیشمی بدەمێ. هەی موبارەک نەبێ، هەرچەند موبارەکیش نەبوو. هاتم کیسەی پارەم دەرهێنا تا پارەیان بدەمێ، ژنەکە هەر چاوی بە کیسەپارە کەوت کە زۆری تیایە، مرخی لێ خۆش کرد. کەوتە سمتەلەقێ و هات بە دەوروپشتما و وتی: «ماشەڵلا چەند کوڕێکی جوانی، ئەوە تۆ ژن و ماڵت نییە. منیش عەزییەکی

جوانم هەیە پێتی بفرۆشم.» وتم: «نەخێر ژنم نییە، ڕێم لە بەرە و ژنیش ناهێنم.» هەر چەند بە دەوروپشتما هات وتی: «خوشکێکم هەیە بەقەد خۆم جوانە، ئەوت دەدەمێ.» وتم: «کەس شک نابەم بەقەد تۆ جوان، ئەگەر ڕاست دەکەی و بەقەد تۆ جوانە، ئەو بە تەڕ و تازەیی با بۆ مێردەکەت بێ، من بە ئالوگۆڕ ڕازیم.» پێکەنی و وتی: «بەخوا تەگبیری باش دەزانی، زاتەن مێردەکەشم لێم تێر بووە، بۆیە منداڵمان نابێ.» هەرچەند خەریک بوو بسازێ، بەڵام من داخی ئەو دوو لیرەیەم لە دڵا بوو و بۆی دەرچووم. دیسان کەوتمەوە سەر جادە، هەندێ ڕۆیم و لە دواوە عەرەبانەیەکی پۆستە بە گرەگڕ هات، لەگەڵ عەرەبانەچی ڕێکەوتم بە دە مارک تا هەر شوێنێ کە دەچم سوارم بکا. سوار بووم و لە ڕێ عەرەبانەچی لێی پرسیم: « بۆ کوێ دەچی؟» وتم: «تا ویانە دەچم.» قاقا دەستی کرد بە پێکەنین و وتم: «ئەوە دۆزیمەوە، تۆ مێردی سارینای. هێشتا ورتەم لە دەم دەرنەهاتووە، تۆ پێدەکەنی.» وتی: «دەزانی ویانە چەندە دوورە، بە حەوت ڕۆژ ناگەینێ.» ئیتر لە داخا سەرم نایەوە و لەناو عەرەبانەکەدا نووستم. سا نازانم چەند نووستووم، لەپڕ هەڵی سانم و وتی : «دابەزە وا گەیشینە دێ.» هەرچەند وتم من بایی دە مارک سوار بووم، وتی: «نەخێر لێرە بەولاوە ناچم.» جا دای بەزاندم.

تێفکریم هەشت بۆ نۆ کچی جوانکیلە دەوریان دام، وتیان ئەفەندی، ئەمشەو میوانی ئێمە بە. من وتم چاکە، ئەوان لەناو خۆیاندا کردیان بە شەڕ، ئەو ئەیوت ئەمشە لای من ئەبێ، ئەوی تر دەیوت نەخێر لای من ئەبێ. کردیانە مقۆمقۆ، من وتم ئێوە نۆ کەسن، نۆ شەو بەند ئەبم و هەر شەوە و لای

یەکێکتان. زۆر پێکەنین، وتم: «شەوی چەندم لێ ئەستێنن؟»
وتیا: «ئێمە هیچ پارە ناستێنین، موسافیر پەروەرین و میوانمان لا خۆشەویستە.» وتم: «ئەی لێرە پیاو ڕووت ناکەنەوە؟»
وتیان: «ئەوە نییە!» هەروا هاتن بە دەروپشتما و پێدەکەنین، ئەویان دەیوت بۆ من، ئەوی دیکە دەیوت بۆ من. پیاوێکی ڕیشسپیی نوورانی پەیدا بوو، کچەکان وەک جنۆکە بیسمیللایان لێ بکەن بڵاو بوونەوە و ڕایان کرد. پیاوەکە پرسی: «لە کوێوە دێیت و بۆ کوێ دەچیت؟»

وتم:

- بۆ ویانە دەچم

- بەو نزیکییە!

- بۆچی دوورە؟

- بە پێیان نایگەیتێ.

- جارێ ئەم نۆ شەوە لێرە دەبم، ئەو نۆ کچەی کە هاتن و لە لام بوون، هەر یەکەیان و بەڵێنی شەوێکیان لێ وەرگرتووم.

- ڕۆلە، ئەوانە هیچیانماڵیان لێرە نییە، هاتوون و بە ڕۆژ شەتڵە توتنیان پێ لێدەدەن، بە شەویش لە دێبەردا دەنوون و دەستەی سوورە خاتەمەکەن.

- ماندوو و مردووم، زۆریشم برسییە.

- لە دێدا جێیەک هەیە وەک ئوتێل وایە، خواردنیشی تیا دەست دەکەوێت.

- بە خێری خۆت پێشانم بدە.

ئیشــارەیەتی بــۆ جــێگەیەک کــرد، هــۆدە خــانوویەکی وەک گەوڕی وڵاخ بـوو، تەنهـا قـاتێکی لە قـوڕ دروسـت کرابـوو. کە چـوومە پێشـەوە، دەرگـایەکی بچـووک و سـێ تەنەکەی نەوت، تەختەیەکی درێژیان بەسەردا ڕایەڵە کراوە و هەندێ بەڵمەبرنج ڕاخـراوە. ئەمە قەنەفەی مـاروکەنی لـۆکس بـوو، دانیشـتم و وچانم دا، هیچ کەس دیار نەبوو. هەتا تیامابوو چڕیم: «هـای لـۆقەنتەچی، هـای لـۆقەنتەچی.» ئەمەندەم شیڕاند خـۆم گـوێم دەزرینگـایەوە، لە پاش قەیـرێ، سـەری زەلامـێ لە کـوونێکەوە دەرکەوت. کڵاوێکی سپی شێتەکانی بیمارخانەی لە سـەردا بوو و بە تــوورەیی وتــی: «کــوڕە چ شــیر و هــووڕێکتە!» وتــم: «مردووت مرێ برسیمە.» وتی: «مردووی خۆت مرێ، پیاوی برســی چــۆن ئەوەنــدە نەعــرەتەی دەبــێ.» وتــم: «ئەی خــۆ ئیشەڵڵا نابووریمەوە.» وتی: «سا کەواتە ڕاوەستە، تا دێمەوە ئەوسـا ئیشـتیهات سـاد دەبێـت.» ڕۆیـی و هـاتنەوەی نەبـوو، دانیشتم و تاقەتم چوو. وەنەوزم دەدا، ناچار هەڵسامە سەر پێ و دەستم کرد بە پیاسەکردن، تا لـۆقەنتەچی ناموبـارەک پەیدا بــوو. ئەوســاکە تەنهــا کەللەیــم دیبــوو و بە سەروســەکوتیا وامزانی ئینسانە، ئێستا کە لەشـی دەرکەوت، هیچی لە ئینسـان نەدەچـوو. بەقەد بەقەد باگردینێک دەبوو، شـەرواڵێکی کورتی شــینی لە پێــدا بــوو، ڕوانکەیەکــی جــاوی نەشــۆراویش بە سنگییەوە، چاوێکی پرش و پوو، چاوێکی وەک کوونی سوژن و لووتێکی کورتی سـەرپانی پەڕەکەدار، لچێکی ئەستووری و ڕەنگێکی سوورفلی هەبوو. وتی:

- ئینجا فەرموو چیت دەوێ؟

- چیم بوێ! برسیمە.

- ئاخر چی دەخۆی.

- چیتان هەیە و لیستەکەتان بە چ زمانێ نووسراوە؟

- لیستەکەمان هەموو زمانێ فێری نەزان دەکا.

- هەی ناموبارەک، لیس و تێلامان نیشان دەدەی!

- ئەی من چووزانم لیسە چییە؟

- بە خوێنــدەوارێک نــاوی چێشــتەکانت بنووســە، ئەوە لیستەیە.

- کاکە تۆ وا دەزانی هیچ کارمان نییە قوتابخانەیەک دانێین، فێری خوێندن بین و لیساولیس دەفتەری چێشت بۆ من بگرن، ئەوەندە مەڕێسە، چی دەخۆی؟

- پروزۆلا.

ئۆف ئۆف، بەخوا منیش ئەوەم دەست کەوێ بەشی کەسی لێ نایەم.

- کەواتە مەشکەیەک دۆم بۆ بێنە.

- ئەفەنـدی مـن ماسـتاوفرۆش نـیم. ئەوەی هەمە مەنجەڵـێ شۆربا و سێ سەلک پەنیرە. کامیان دەخۆی بۆت بێنم.

هیچ چارم نەما وتم: «شۆربا.» لۆقنتەچی گوم بوو، پاش قەدەرێک لە بکەکوولەکەی کەلا شۆربای هێنا، کەفی شین و مۆر بە سەریەوە وەستابووەوە، وتم:

- ئەوە چییە؟

- شەوە شۆربای مێردانە.

- شۆربای مێردان چییە؟

- تۆ بیخۆ دەزانی، بەڵام ئاگات لە دەمت بێ نەسووتێ، بە ئاگری توونی حەمام کوڵاوە.

ئۆف ئێجگاری تافی تێکرد. وتم:

- چۆن دەخورێ؟

وتی: «ڕاوەستە پیشانت بدەم چۆن دەخورێ.» ڕای کرد و چوو لە ژوورەوە کەوچکێکی قووڵی چێشتێکردنی هێنا و لە کوولەکەی شۆرباکەی هەڵدا و فوویەکی لێ کرد و کردیە دەمیەوە، مڵچەیەکی لێهات و قووتی دا. دەمێکی بۆ تەقاند و وتی: «هەی هەی چ شۆربایەکی ناسک و نازدارە.» کەوچکێکی تری هەڵگرت و وتی: «ئێنجا فێری شۆرباخواردن بووی؟ با ئەم کەوچکەشت لەبەرچاو بخۆم، ئیتر تەواو فێر دەبیت.» تێفکریم هیچی تیا ناهێڵێ، ناچار وتم: «ئەو کەوچکە بۆ من و کوولەکەی شۆربایەکە بۆ تۆ.» کەوچکی دایە دەستم و شۆربای ناو کوولەکەی نا بە سەریەوە و هەڵی قوڕاند و هەڵی چۆڕاند.

پرسیم: «هێلکە لێرە دەست دەکەوێ؟» وتی: «کە پارەت هەبێ، مادامی منیش دەست دەکەوێ. ها چاک بوو هێلکەت هێنایەوە بیرم، ژنەکەی من مەشهوورە و هێلکەوڕۆنی چاک دەکات. با پێی بڵێم هێلکە و ڕۆنێکت بۆ بکا قامکی خۆتی پێوە بخۆی.» وتم: «دەخیل ئەوەم لەگەڵ مەکە! من بە پەنجە و قامک کەمان لێ دەدەم، ئەگەر قامکی خۆم بخۆم بەچی کەمان بۆ خانمەکەم لێ بدەم؟»

سەرتان نەیەشێنم، پاش نیوسەعات خۆی و ژنەکەی هاتن پارچە تەنەکەیەکیان چاڵ کرد و دوو هێلکەیان شکاندۆتە ناو ئاوەوە و ئەمەندەیان کوڵاندووە بووە بە بەردی ڕمق. تەنەکە چونکە ژەنگی هەبوو، هەموو ژەنگاوەکەی دابووە هێلکەکە و سەوزی کردبوو، وەک پینەکەوش لەناو تەغاراوی پینەچیدا ڕەش هەڵگەڕابوو. هەرچی پووش و پەڵاشە بە ئاگرەکەوە سووتاوە و مەڕۆکەی کەوتۆتە سەر هێلکەکە، ئەوەیە هێلکەوڕۆن! ئافرەتەکەیش خۆیشی عەینەن ورچەکەی مندۆڵ، کوڵەبنەیەکی مل لە سنگ دەرهاتوو، هەموو دەموچاوی بە سپیاو سواغ دراو، دوو چاوی وەک کونە سووژن بە قوڵداچوو. چڕ لە کل و دەمێکی پانی سواڵەتی هەبوو، تەنها دوو ددانی بێڵەکانی لە پووکی سەرییەوە بۆ لووت هەڵگەڕابوونەوە، دەمیشی ئەوەندە چاڵە وەک قەڵتاخی زین چەناگەکی بۆ لای لووت هەڵکشاوە. دووکەڵی پووش و پەڵاش چووە بە چاویا و کلەکەی تواوەتەوە و بەسەر ئەو ڕوومەتە جوانەوە ڕێ ڕێ هاتۆتە خوارێ. وەک پۆپەشمینی میل میل جێی دڵۆپەی کلەکە دیارە. ڕۆینێکی وەک بێشکەی شکاو، یاخود وەک پاپۆڕێکی ناو شەپۆلی دەریا «یالبا» ئەمدیوە و دیو بکا، بە ترپە ترپ هاتە بەردەمم و وتی: «چۆنە هێلکەوڕۆنەکە؟ ئەوە بەم دەستە ناسک و نازدارانە بۆم دروست کردووی.» هات دەستیم پێ نیشان بدا وتی: «پێ و پووزیشم هەر جوانە و لە هێلکەوڕۆن بەلەزەتترە.»

ئەوەتا کابرای مێردیشی ڕاوەستاوە. وتم: «ڕاست دەکا ئەوەندە بەلەزەتە؟» وتی: «هێلکەوڕۆنەکە بخۆ تێدەگەی.» دیاربوو بە ئاشکرا نەیدەوێرا دەردی بێتامیی بەیان بکا و

دەیشـیزانی هـێلکەوڕۆنەکە نـاخورێ. ناچـار لە برسـانا هـاتم پووش و پەڵاشی سەر هێلکەم لادا و هەندێکیم بە نانی ڕەشـی چەورەوە خـوارد. مـادامیش هەر مەدحـی هێلکەوڕۆنـی دەدا کە چەند بەلەزەتە و مەبەسـتیشـی هەر خـۆی بـوو. وتـی: «بـا لێرە ژنێکت بۆ بێنم.»

هەر ئەوەندە لە دەمم ترازا وتم: «دەسا دەی بتبینم.» وتـی: «کچێکی زۆر شیرین و جوان، بەقەد خۆم جوانە، ئەمما نەختێ لە مـن کـورتترە و نـاوی «مـارگۆ»یە، حـازر و بـزر، ئەمشـەو بۆت دێنم. ڕاوەسـتە بـا هەر ئێسـتە بانگی کەمە ئێرە.» هەر لە خـۆیەوە هەڵسـا وەک تەشـپیلە خـل بـووەوە و ئەوەنـدەی هێلکەوڕۆنەکەی پێ نەچوو، یەکێکی لە خـۆی کوڵەبنتری هێنا. من دانیشتم و ئەو بە پێوە، هێشتا من کەڵەگەتتر بووم! کەوتینە گـاڵتە، مـن مەبەسـتم ئەوە بـوو ئەو شـەوە نەختێ بە گـاڵتەوە ڕابـوێرم. بەیـانیش زوو شـانم پیـا دەکـرد، کەچـی ئەوان بە ڕاسـتیان بـوو. وتیـان وا بـڕایەوە، هەر بەو شـەوە هەمـوو ئاواییـان دەنـگ دا کە بەیـانی بێـنە دەعـوەتی مـارەبڕین و خەبەریشیان دابوو بە ڕاهیب کە سبەینێ زوو حازر بێ. منیش وتـم: «باشـە. بەڵام جـارێ زۆر مانـدووم و خەوم دێ، لـێم گەڕێن با نەختێ بنووم.» کچە وتـی: «حەی، مـن ئەمشـەو لە خۆشـیانا نـانووم، تۆ هەر وا زوو دەنووی.» بە هەزار ئـاین و ئۆین ئەوانـم لە خـۆم دوورخسـتنەوە. منیش هـیچ خـۆم ڕووت نەکردەوە، وتـم نەک سـبەینێ تـا مـن خـۆم کۆ دەکەمەوە، بێنە سەرم. هەروا لێی ڕاکشام.

سا کاری بەختی ناسـازم، بەیانی وەختێ خەبەرم بووەوە، چـوار دەورم بە ژن و پیـاو و پاپـاش گیـراوە. شـاییە و

کچەکەیان کردە سەرم و هەڵیانسەندم، پاپاش هاتووە مارە دەبڕێ. ئەوەندەم پێ کرا وتم: «ڕاوەستن تا دەموچاو دەشۆم.» وتیان: «مەسینە و لەگەنت بۆ دێنین.» وتم: «ئاخر ئیشی سەراوم هەیە.» بە هەزار حاڵ خۆم گەیاندە دەرەوە، دیسان سەرم دەخورا، بانگم کرد دەستگیران بە دوعا، ئینجا ڕامکرد. هەر ئەوەندەم زانی ژن و پیاو، گەورە و بچووک شوێنم کەوتن.

هەردوو کوڵەبنە، یەعنی ژنەی ئوتێلچی و دەستگیرانیش بە خلەخل بە دوامدا هاتن. منیش لە پێشدا بەخوا وەک تیر لە کەوان دەرچی، ڕامکرد و تێیەڕیم. بەڵام کوڕە لادابیەکان لە من بەلاتر بوون، تەنگیان پێ هەڵچنیم و لەو وەختەشدا جۆگەئاوێکم هاتە ڕێ. هاتم لێی بپەڕمەوە تێفکریم زۆر قوڵە و لە دوایشەوە دوو کوڕی بەکێشیان نزیک بووبوونەوە، ناچار لەناو ئاوەدا خۆم کوتایە بن پەرچێک، تەنها سەرم بە دەرەوە بوو. شەبقەکەم ئاو بردی، ئەو دوو کوڕە ئاخری دۆزیمیانەوە و گرتمیان. وتیان: «هەر دەتکوژین، یا پارەی ساڵێکی کاسبی خۆمانمان بدەری، یا تەسلیمی خەڵکی دێت دەکەین.» سەنگە سارت بکەن وتم: «بابە بمپەڕێننەوە ڕەزام بە ڕەزای خوا شەش لیرەتان دەدەمێ.» ئاخر پارە بۆیە چاکە، پەڕاندمیانەوە و پارەکەم دانێ و بەریان دام. سا قەدەرێ ڕۆییم، ترسی شوێنکەوتووانم نەما، لە کەناری ڕێ لێی دانیشتم و تێفکریم. ڕێبوارێ پەیدا بوو، هەر وەکوو ئەو ڕۆژەی من چۆن لە ماڵی باوکم بە جلە شڕەکانمەوە هاتبوومە دەرێ و توورەکەی کەمانەکەم کردبووە ملم. ئەویش بەو جۆرە بە ڕێدا دەهات، لەگەڵ چاوم بە کەمان کەوت، لە خۆشیانا کەوتمە سەما،

چووم دەستم کردە ملی. «هەی بەخێربێی کابرا.» وای زانی من شێتم و لەوە دەترسا کەمانەکەی بشکێنم، وتی: «ئامان چی دەکەی.» وتم: «کەمان لێدەدەم.» هەر لەوێ دانیشتم، کەمانم لە توورەکە هێنایە دەرەوە، ماچێکم کرد و دەستم کرد بەو مەقامی هیجرانە کە بۆ خانمم لێدابوو. هەر ئەوەندەم زانی کابرا ئاوازێکی لێ بەرز بووەوە، دەنگ و سەدایەک دار و بەردی هێنایە جۆش، هیچ گیانلەبەرێک ئەو دەنگە خۆشەی نەبوو، بیری ڕۆژەکەی ناو بێشەم کەوتەوە، کە خانمەکەم بە کەمانەکەی من گریا، منیش بە دەنگی ئەم کوڕە زۆر زۆر گریام. کە لێبووینەوە پرسیم:

- براکەم، کێی و ناوت چییە، بۆ کوێ دەچی؟

- فریدریک شۆللەری ئەڵمانیم، بە گەشت دەگەڕێم.

- ئۆخ بەخوا چاک ڕێککەوتووە، فرێدریک شۆللەر، منیش ئەلفرێد مۆلەر. تۆ خاوەنی ئەو دەنگە و منیش ئوستادی ئەم کەمانە بین، گەنجی دنیا هی ئێمەیە. من هیچم پێ نەبوو بیخۆم، بەڵام ئەو هەندێ باسوورمە و نانی پێ بوو. خواردمان و ڕوومان کردە قاپی خوا و کەوتینە ڕێ. دەمەوئێوارە ڕێمان کەوتە شارێکی گەورە، هیچمان نەماندەزانی کوێیە. پرسیمان، وتیان ئەمە شاری میونخە. کاری ڕاست بێ ڕاهیبەکەمان دەرسی جوگرافیای پێ وتبووم، دەمزانی لە ئەڵمانیا شاری میونخ هەیە. کە هاتینە ناو شارەوە، گەیشتینە بەردەرگایەکی گەورە، دوو دوو سەکۆی هەبوو، بە فریدریکم وت، تۆ لەوبەر دانیشە و من لەمبەر با ئەهەنگێ بکەیین. ئێمە دەستمان بە کەمان و گۆرانی کرد و لە سەرەوە هەرچی پەنجەرەیەک بوو

کرایەوە، ئافرەتی جوان جوان و پیرەمێردی نوورانی سەریان لە پەنجەرە هێنایە دەرێ، ئیتر گوێیان لێگرتین. کە لێبووینەوە، ئەمەندەیان پارە بۆ فڕێداینە خوارەوە کە تەپلەکەی فریدریک پڕ بوو.

پیرەمێرد ئەوەیشی بە کەم زانی و ڕیاڵێکی زیوی ئەڵمانی کە بیست مارک بوو، بۆ هاویشتینە خوارێ. ئەمانەمان کۆکردەوە، فریدریک وتی تۆ هەڵی گرە با پارە لای تۆ بێت، منیش کردمە دەستەسرێکەوە. نەختێکی تر ڕۆیشتین و ماڵێکی لەوە گەورەترمان تووش هات. لەوێش دەستمان کرد بە ئاهەنگ و پارەی زیاتریشیان داینێ، تێگەیشتین کە خەڵکی میونخ ئەهلی ڕزقن. لەو وەختەدا پیاوێ هات وتی: «وەرن بتانبەمە ماڵێک، لەوێ گۆران بڵێن و زۆرتان دەدەنێ.» پێشمان کەوت و بردینیە قۆناخێک بەقەد سەرایەک دەبوو، هەروا بە باخچە و دیوەخاندا سەری خستین تا گەیشتینە حەرەم و لە سالۆنێکی گەورە دایان ناین. وردە وردە ئەهلی ماڵەکە گردبوونەوە، پیاوێکی زۆر کیبار بەخێرهاتن و ماندوونەبوونی لێ کردین و ناوی پرسین و لە پاشان وتی: «برسیتان نییە.» من تەمام بوو بڵێم برسیمانە، فریدریک ئەنیشکێکی تێوە ژەندم، تێگەیشتم و وتم: «نەخێر، تێرین.» وتی: «وا ئێوارەیە، ئێستا هیچ مەخۆن، با ئێوارە ئیشتیهاتان هەبێ.» بەوەدا تێگەیشتم کە ئێوارە گلمان دەداتەوە. هەروا وەختمان ڕابوارد و ئێوارە سالۆنەکە پڕ بوو لە میوان. ئافرەت هەر یەکەو چوونە ژوورێکەوە، خۆیان ڕووت دەکردەوە و جلی «بالیە»یان لەبەر دەکرد و دەهاتنە «شەوئاهەنگی» بالیە. دوایی کچێکی پیانۆژەن چووە بەردەم پیانۆکە، بە منیشیان وت هەڵسە

بچۆره تەنیشت ئەوەوە، تۆیش بە کەمان ئاهەنگی لەگەڵ بکە.
ئەو ساڵۆنە ڕۆنی بریقەیان لە فەرشەکەی دابوو، تەنها بۆ ڕێبازێکی باریک، سەرەنازی تەسکیان ڕاخستبوو. قۆندەرەکەم ئەمەندە قوڕاوی بوو کە ڕووم نەهات بەو قۆندەرەیەوە بەسەر ئەو فەرشانەدا بڕۆم. لە لاڕێکە پێم لەسەر تەختە بریقەدارە لووسەکە دانا. بە جارێ هەڵخلیسکام و مێزێک لە بەردەمما بوو کە ئەنواعی پیاڵە و قاپ و شووشەی لەسەر بوو، قلْپم کردنەوە و هەمووی تێکشکا و بە کنگەخلیسکە گەیمە ئەسکەملەی کچەی پیانۆژەن، پێم بە پێچکەی ئەسکەملەکەی ئەو گرتەوە و ئەسکەمل وەرگەڕا. مادموازیل بە قۆڵی ڕووت و نەرمۆڵە بە سەرما کەوت و منیش لەسەر گازی پشت ڕاکشابووم. لە پەوڕوو تێم چەسپی، هەڵکەوتێکی باش بوو، بەڵام من تەتەڵەیم شکابوو. جوتکەم ژانی دەکرد و ماڵی ئەوەم نەبوو لەزەتی لێ ببینم. هەندێ پێمان پێکەنین، هەندێ بەزەییان پیامانا هات. فریدریک فریام کەوت، کچەی لەسەر هەڵساندم و منی ڕاست کردەوە، بەڵام حاڵم نەمابوو، غیرەتم دایە بەر خۆم بەوەی کە چاک بوو سارینای تەڕپیری خۆم لەوێ نەبوو تا تەریقم بکاتەوە. خاوەنماڵ بە تەلاشەوە پرسیی: «هیچ کوێت نەشکاوە؟» وتم: «کاشکێ ملم بشکایە و ئەوەم خەسار نەدایە!» وتی تۆ خۆش بی قەیناکە. چارەکەسەعاتێ ئاهەنگیان پەک خست تا ژانی جوتکەم شکا و کچە پیانیستەکە چووەوە سەر پیانۆ، منیش چوومە لایەوە و کەمانێکی وام لێدا تۆڵەی هەموو خەسارەکەم کردەوە. فریدریکیش بەخورداربێ ئەمەندە جوانی خوێند، خەمی لە دڵی کەسا نەهێشت. ئینجا وچانێکمان گرت و دەستمان کرد بە شەمپانیا خواردنەوە. هەر من

دەمخواردەوە، فریدریک لێم تووڕە دەبوو، فائیدەی نەبوو، تا دەبەنگ بووم و هۆشم بە خۆمەوە نەمابوو. هەڵسام نوقێکم دا و ورد و درشت پێم پێکەنین، ئینجا کەوتنە جووتە جووتە کەوتنە دانس و ژن و پیاو پێکەوە هەڵدەپەڕین. من کەسم بۆ نەمابووەوە، کچێک لە بەردەرگا وەستابوو، لە پێشچاوم جوانی نواند. ڕامکرد و چوومە بەردەمی، کڕنووشێکم بۆ برد و وتم: «وەرە من و تۆیش دانس بکەین.» کچە دایە قاقای پێکەنین و ڕایکرد. چوومە بەردەم خاوەنماڵەکە و وتم: «بۆچی من بە پیاو نازانن لەگەڵم هەڵناپەڕن؟» وتی: «ئەوەی تۆ چوویتە لای کارەکەرە، بۆ ئەو ناشێ لە سالۆنی ئێمەدا دانس بکا.»

وتم: «سا کەواتە خانمێکم بدەرێ.» پێکەنی و وتی: «ئەمانە بە من نابەخشرێن، دەبێ خۆیان ڕازی بن.» خانمەکان کە گوێیان لەم گفتوگۆیەی من و ئاغا بوو، بە پێکەنینەوە دەستیان بەردا و لێم کۆبوونەوە. ئەویان دەیوت فەرموو لەگەڵ من، ئەوی تریان دەیوت بۆ من. نیهایەت لەناو خۆیاندا چوار شۆڕەژنی بەگوڕ و زۆرداریان هەڵبژارد، چوار پەلیان گرتم و مەشکەژەنێیان پێ کردم. نەخێر! جۆشم نەدەنیشتەوە، تا فریدریک قۆڵی گرتم و لە سالۆنەکە بردمیە دەرەوە. هۆدەیەکیان نیشان داین و کچێکی کارەکەر لەگەڵمان هات و جێگای بۆ ڕاخستین، بە سەرخۆشییەوە دەستم کرد ملی و وتی: «چی دەکەی؟» وتم: «ئەی ئاغا پێی نەوتی؟» وتی: «هەی نامووبارەک!» سیخورمەیەکی لێدام، ئەوەندە سەرخۆش بووم کەوتم و خۆیشی ڕایکرد. ئینجا فریدریک لێم تووڕە بوو، وتی: «ئێستا خاوەنماڵ بزانێ تۆ وا دەکەی، دەرمان دەکا.» وتم: «جا با دەرمان کا، پارەی زۆرمان پێیە و دەچینە ئوتێل.»

به هەر حاڵێ بوو فریدریک دایمرکاندم. خۆم ڕووت کردەوە تا بنووم، ئەمەندە شەمپانیام خواردبووەوە کە ئێشی سەراوم زۆر بوو، هاتمە دەر تاکوو بچمە ئاودەستخانە. ڕێگام نەدەزانی، هاتمە دەرێ بەڵکوو یەکێک ببینم و ڕێی ئاودەستی لێ بپرسم، کەس نەبوو. میز تاوی دام و وامزانی شاتووەکەیە، قاتی سێیەم ئاودەستخانە بێ. دەستم کوتا، بە پەلەکوتێ دوو دەرگام ژمارد و سەری سێیەم دەرگا کردمەوە و پێم نایە ژوورێ، لە یەکێ هەڵەنگووتم و ڕاست بووەوە هاواری کرد: «دزە، های دزە.» گەڕامەوە و ڕامکرد بۆ ژوورەوە. هاتم خۆم بکەم بەژێر لێفەوە، ئافرەتێکی تیابوو ڕاپەڕی و هاواری کرد: «ئەمەتا، ئەمەتا بەقوربانتان دەری نەکەن، ئەم دزە هاتە ژوورەکەی من.» تووومەز بە هەڵە هاتوومەتە ژووری ئافرەتێک، بە ژووری خۆمانم زانیوە. بە هاواری ژنە خەڵک ڕوویان کردە ژوورەکە. منیش چارم نەما و دەرگام خڕ داخست، لە دەرەوە خەریک بوون دەرگا بشکێنن، ناچار پەنجەرەم هەڵدایەوە و بێ ئەوەی بزانم بەرزە یان نزمە، لە پەنجەرەوە خۆم حەوادایە خوارەوە. سا تا من ئەمەم کرد ئەوان دەرگایان شکاند، هاتبوونە ژوورەوە و زانیان من خۆم لە پەنجەرەوە فڕێداوەتە خوارەوە، بانگیان کردە باخەوان پاول. دزە دەری مەکەن! باخەوان بە خۆی و تێلاکەیەوە و گەماڵێکی زلەوە پەلاماریان دام و ڕامکرد. درەختێکی گەورەم هاتە پێش، خۆم هەڵدا سەرکەوم سەگەکە لە دواوە دەرەلنگی دەرپێکەی گرتم و پچڕا. بە هەر حاڵێ بوو چوومە سەر درەخت، پاول پێڵاوی داکەند بە شوێنما سەر دار بکەوێ. تێفکریم لقی دارەکە بەسەر کۆڵاندا شۆڕبۆتەوە چوومە سەر ئەو لقە و خۆم

داهێشتە خوارێ بۆ کۆڵان. خوا و ڕاستان ئەمجارە کەوتمە سەر کۆمەڵە پەینێ کە بۆ باخیان هێنابوو و ئازارم نەگەیشت. هەڵسام ڕامکرد، باخەوان و سەگ بە شوێنما خەریک بوون دەرگای باخەکە بکەنەوە، من لەوزەی ئەوان دەرچووبووم. بە درێژایی کۆڵان ڕامکرد و لە سەری کۆڵان کتوپڕ بەرەنگاری حەسحەسێ هاتم. چەتەوڵێک توند قۆڵی گرتم. وتی: «ئۆخەی بەرگیرم کەوتی، دوێشەویش هاتبوویتە سەر ماڵی میلار، تا دزی بکەی.» هەرچەند وتم باوکم پیاوی چاک بە ئەزیەتم مەدە بەخوا دز نیم، فایدەی نەبوو. زۆر زل و بەهێز بوو، لەبەر ئەوەی منی بە هیچ نەدەزانی، قۆڵی شل گرتبووم و فرسەتم لێ هانی. قۆڵم ڕاتەکاند و مستەکۆڵەیەکم لەسەر سنگی دا و بە پشتا کەوت. دیسان ڕامکرد، بەڵام هیچ هێزم تیا نەبوو، کابرایش هەڵسایەوە و فیقەیەکی لێدا و چوار حەسحەس ڕایان کرد. چوونە لای کابرا وتیان چی بوو، وتی دزێکم گرت گوێم نەدایە لە دەستم ڕای کرد. منیش لەو وەختەدا دەرگایەکم هاتەپێش، دەستم پێوە نا و کرایەوە، چوومە ژوورەوە و دەرگام داخست و لە کەناری دەرگا ڕاوەستام. دووانیان وتیان ئێوە ڕا بکەن و سەری ئەو کۆڵانەی تری لێ بگرن، وا ئێمە لێرە دادەنیشین و بزانین لە کوێوە سەرهەڵدەدا. دیا ڕەببی من چی بکەم! ئەوەتا ئەمانە لە بەردەرگا دامەزران، چار چییە. لەو وەختەشدا ترپەی پێی زەلامێک هات. ئەها ئەوە، ڕایان کرد. دەبینم سەرخۆشێکە و بە لادا دێ، کە سەرخۆش حەسحەسی دی بانگی کرد: «کوڕە ئێوە کێن وا بەر دەرگاتان بە من گرتووە؟» حەسحەسەکان ناسیان، وتیان: «ئەوە تۆی ڕینکەر؟» وتی: «بەڵێ منم، ئێوە

کێن لەبەر دەرگای من هەڵوەستاون؟» کە ڕینکەر وای وت ئێجگار ورەم بەردا، ئای خۆ ئەمە ماڵی ڕینکەرە، ئێستا دەرگا دەکاتەوە و دێتە ژوورەوە، جا ئەوکات چی بکەم.

وتیان: «دزێکمان تا بەردەرگای تۆ ڕاوناوە، ڕەنگە خۆی کوتابێتە ماڵی ئێوە.» وتی: «سا دەخیل بەجێم مەهێڵن، لەگەڵم وەرن و ماڵەکە بگەڕێن.» ئێجگاری ڕۆحم چوو. بەڵام حەسحەسەکان وتیان: «تۆ بچۆرە ژوورەوە، ئێمە لێرە دەبین مەترسە.» ڕینکەر دەستی نا بە دەرگاوە و داخرابوو. وتی: «حەی، من هیچ شەوێ دەرگام دانەخسووە کەچی وا ئەمشەو دەرگام داخراوە.» کلیلی دەرهێنا دەرگا بکاتەوە، من چارم نەما، چووم بەرەوژوور، بە تاریکی و پەلە کوتێ قادرمەم دۆزییەوە و سەرکەوتم. ئەویش دەرگای کردەوە و هات لە پێپلیکانە سەرکەوت. من دەستم کوتا و دەرگایەکم دۆزییەوە و چوومە ژوورەوە و دەرگام داخست. توومەز ئەمە ئاودەستخانەیە. ڕینکەر ڕاست ڕووی کردە ئاودەست تا بێتە سەراو، دەرگای ئەویش داخرابوو. وتی: «پەنا بە خوا، ئەمشەو هەموو دەرگایەکم لێ داخراوە.» وامزانی دەرگای ئاودەستخانەکە دەشکێنێ و دێتە ژوورەوە. کەچی وتی قەیناکە جارێ با جێگایەکم دەست کەوێ و کەمێ ڕاکشێم، دوایی دێمە سەرئاو. وەرگەڕایەوە و زرم بۆی کەوت. قەدەرێ بۆڵاندی کە هەستایەوە ڕووی کردە دەرگایەکی تر، ئەویش داخرابوو. ئینجا ئێجگاری تووڕە بوو و دەرگای دایە بەر لەقە. دەنگی ئافرەتێک هات و وتی:

– وەحە، وەحە گا شێتە! ئەو دەرگایە بۆچی دەشکێنی؟ پارەت زۆرە؟

وتی:

- شــۆخ و نــازدارەکەم، ئەمشــەو ســەعاتم لەگەڵ خــۆم نەبردبــوو بــۆیە درەنــگ هــاتمەوە. لەعنەتنــامەم بــێ ئیــدی بــێ سەعات نەچمە دەرەوە.

ئەم پــاڕایەوە و ئەو جنێــوی دا و بە هەزار کێشــمەکێش دەرگــای لــێ کــردەوە. منــیش دڵــم تەســەللای هــات، دەرگــای ئاودەســتم کــردەوە و هــاتمە دەرێ، لە بەردەرگــا قوتــوویەک شــخارتە کەوتبوو، هەڵم گرت و هاتمە بەر قاپی دەرێ. خۆم داگرت و هێشتا حەسحەسەکان لە بەردەرگا دانیشتبوون. هاتم بە حەوشــەکەدا گەڕام و وتــم بەڵکــوو باخچەیــان هەبێــت لە پشــتەوە دەربــاز ببم. تووشــی هــۆدەی چێشــتخانەیان هــاتم و چــوومە ژوورێ. شــخارتەم لێــدا و مــۆمێکم دۆزیــیەوە، دام گیرســاند و گەڕان بــۆ خــواردەمەنی، هیچــی تیــا نەبــوو. سەبەتەیەک جلی چڵکنی تیابوو، ڕوانیم بەڵکوو شتێکی وای تیابێ لەبەری بکەم. هەمووی کراسی تەنکی دانتەلەداری ژنانە بوون و کەڵکی منیان نەدەگرت. لەژێرەوە چاکەت و پانتۆڵێکی کۆنی پیســی لە نەوت و بــۆیە هەڵکێشــراوی تیــابوو. زانــیم کە ئەمە جلی بۆیەچییە. چارم ناچار بوو و لەبەرم کرد. مایەوە سەر شەبقە و قۆندەرە، شەبقەیەکی کۆنی جاویشم دۆزییەوە، قۆندەری کۆنیان زۆر بوو و وا دیار بوو کۆیانن کردبوونەوە تا بیانفرۆشن. گەڕام و جووتێکیان بە پێمەوە چوون، کردمنە پێم. هــاتمە دەرێ و چــراکەم نەکوژانــدبووەوە. لە پشــتەوەی باخچەکەیان دیوارێکی نزم هەبوو، بازم دایە کۆڵان. جا شتێکی تــر زەحــمەت بــوو، مــن لە کــۆڵانی بەرەوە هــاتبووم و ئێســتا کەتبوومە کۆڵانی پشتەوە. ڕێگای ماڵی یۆهانم نەدەدۆزییەوە.

یەعنی ئەو ماڵەی کە شەو لەوێ رامکردبوو و فریدریکی لێمابووەوە، نەمدەناسییەوە.

هەروا هاتم بە ڕێدا و شەویش هێندەی نەمابوو. تووشی بیرەخانەیەک بووم و چرای دەسووتا و کەسی تیا نەبوو. تەنها زەلامێک لەسەر قەنەفەیەک ڕاکشابوو. بەوبەریەوە ڕاکشام و ئەوەندە ماندووبووم خەوم لێکەوتبوو، کاتێ خەبەرم بووەوە، کابرای بیرەخانە لەگەنێ ئاوی پیا کردبووم و شڵپەم دەهات. قەدەرێک جنێوم پێدا، پێکەنی و ناچار هەڵسام بەیانی بوو، بە پرسیار ماڵم دۆزییەوە و لەسەر سەکۆی بەردەرگایان دانیشتم. ڕووم نەدەهات لە دەرگا بدەم، سەرماش کاری لە هەموو جەستەم کردبوو. وەک کەروێشکێک هەزارەم دەکرد. گەیمە بەر پەنجەرەی ماڵێک، پەنجەرە کرایەوە و لەسەرەوە پڕ قەعدەیەک پیسایی منداڵم بە سەردا کرا.

دە ئینجا بەم حاڵ و بەرگەوە چی بکەم؟

خۆم تەکاند، گەڕامەوە لای ئەو ماڵەی کە تیایا بووین، تێفکریم لە باخچەکەدا فریدریک دەگەڕێ توومەز هاتووە بزانێ شەو من لە کوێوە ڕامکردووە. کە چاوم پێکەوت بانگم کرد، نەیناسیمەوە، بە هەزار حاڵ تا وتم: «کوڕە ئەلفرێدم.» وتی: «خوا بتگرێ ئەم قیافەتە چییە؟» وتم: «مەپرسە!» ئیتر هات دەرگای لێ کردمەوە. ئەوان هێشتا نووستبوون، بردمیە هۆدەکەی خۆمان و بۆگەنم لێ دەهات. وتی: «گورج جلەکانت داکەنە، جلەکانت داکەنە.» وتم: «ئەوە جلی ماڵی کابرای سەرخۆشە هانیومە، دەبێ بۆیان بەرمەوە.» وتی: «مردووت

مـرێ جـارێ وەختــی ئەوە نیــیە، زوو خــۆت ڕووتەوە کە.»
هەرچیم لەبەردا بوو دامکەند، بەڵام فانیلە و کراسەکەیشـم تەڕ
بووبوون و هیچ نەبوو لەبەری بکەم. دەرگا کرایەوە و کچە
کـارەکەرەکە کە شـەوێ دەسـتم کردبـووە ملـی، بە پێکەنیـنەوە
هاتە ژووری. وتی: «دەستگیران بەخێربێیتەوە، چاوم لێت بوو
بە جلـی زاوایەتیـیەوە هـاتیتە ژووری، ئەی بەو جـلانەوە بـۆ
نەهـاتی دەسـت بکەیـتە ملـم.» نەختـێ تەریـق بـوومەوە، چـوو
کراسێکی دانتەلەداری ژنانەی خۆی بۆ هێنام بەروپشت لەبەرم
کـرد و ڕاکشـام، تـا هەمووبـان خەبەریـان بـووەوە. خاوەنمـاڵ
ناردی بە شوێنما. من بە شـەرمەزارییەوە چووم دوعاخوازیم
لێکرد وتـی دەڕۆم. هەرچەند لەگەڵـم خەریک بـوون بەند بـم،
بەند نەبووم. بەخششێکی زۆریـان داینێ و هـاتین ملی ڕێمـان
گرت تا گەیشتینە ویانە[٢].

---

[٢] وەرگێڕی ئەڵمانیی دەڵێ: کتێبەکە زۆر بوو، ناچار لێمان کورت
کردەوە. لەم ماڵی شەوناهەنگەدا پەتپەتیی زۆرتری بەسەر
هاتبوو، لەوێوە هەڵمان گرت و بە قاڵیچەی حەزرەتی سلێمان
گەیاندمانە ویانە. پیرەمێرد.

# فەسڵی چوارەم

**شاری ڤیانە**

کە گەیشتینە شاری ڤیانە، بە فریدریکم وت: «برادەر، وا ئێمە گەیشتینە ئێرە، من هەر ئەوەندەم بەس بوو، هەرچی پارەیەکمان هەیە هەمووی بۆ تۆ. کەمانەکەیشت بۆ خۆت، من خانمەکەم دەدۆزمەوە.» وتی: «برادەر، ئەمەیش مەکە بە ماڵی کابرای میوونخی، ڕاوەستە. تۆ هەروا بە ئاسانی ماڵی خانمەکەت نادۆزیتەوە، پارەت پێ نەبێ سەرگەردان دەبی، جارێ با پێکەوە بین تا جێگیر دەبیت. ئەوسا بۆ منیش خوا کەریمە.»

ئینجا بە جادەدا دەڕۆیشتین و هەروا خەڵم پێمان پێدەکەنین، توومەز ئەو قیافەت و جلوبەرگەکەی ئێمەیە کە لەناو ئەواندا عەیب بوو. هەر ئەوەندەمان زانی یەکێ بانگی کردین: «کوڕە ڕاوەستن.»

ناچار ڕاوەستاین، هاتە پێشەوە: «ناوتان چییە؟» من وتم: «چیت لە ناوی ئێمە داوە؟» شانی ڕەتەکاندم. وتی: «ئێستا تێت دەگەیەنم کە بۆچی ناوت دەپرسم!» توومەز ئەمە پۆلیسە، وتم: «من ناوم ئەلفرێد مۆلەر، هاوڕێکەشم فریدریک شۆللەر.»

- لە کوێوە دێن؟

- نازانم، چووزانم شاتووی خانمەکەم لە چ شارێکە؟

- کەوابێ خەڵکی نەمسا نین؟

- نەخێر.

- کەوابوو پەساپۆرتتان کوا؟

- جارێ تێم بگەیەنە پەساپۆرت چییە؟ چونکە ناوی نازانم.

وتی: «کەواتە پێشم بکەون.» بردینیە قاپییەکی گەورە. خۆی شەبقەی داگرت، چووە ژوورەوە و ئێمەیان بانگ کرد و شەبقەمان دانەگرتبوو. شەبقەکەیان فڕێداین و داوای پەساپۆرتیان کرد. ئێمەش نەمان بوو و حەپسیان کردین و پارەکەشیان لە باخەڵ دەرهێناین. وتینان دزیوتانە. هەردووکمانیان کردە هۆدەیەکەوە، کز و مات ڕاکشابووین، خەومان لێکەوتبوو. لەپڕ یەکێ هاتە ژوورەوە و پێیەکی پیانایین. کە خەبەرم بووەوە وتی: «تۆ کێی؟» وامزانی پۆلیسە و دەمانپشکنێ، کە تێفکریم سورفلێکی چاوشینە. وتم هەبێ و نەبێ ئەمە ئینگلیزە. کەچی مرەیەکی لێوە هات و وتی: «یەس، یەس.» بیستبووم یەس بە ئینگلیزی بەڵێیە، ئیتر نەمدەزانی دەڵێ چی. فریدریکم هەڵساند، کابرا زۆر سەرخۆش بوو و بە لادا هات. وتمان: «با نەکەوێ بە سەرمانا.» پەلمان گرت و دامانا. دەستی کردە جنێو – یو ئاڕ ئەینەس- دەمزانی جنێوە، بەڵام نەمدەزانی بەر خۆم یان دایک یان باوکم دەکەوێ. ئێمە هەر پێدەکەنین و کابراش هەر جنێوی دەدا، زانی بە زبان تێناگەین، ئینجا بە دەست و بە ئیشارەت بۆی تەرجومە کردین. هەردوو دەستی لەسەر سەری دەکرد بە دوو گوێچکە وەک گوێدرێژ و *عاعا* دەزەڕی، یانی ها ئێوە کەرن.

ئێمەش بەدەست ئیشارەتی ناشرینتر و جنێومان بۆ دەکرد، تا چووین بە گژ یەکا و بە هەردووکمان دەرەقەتی نەدەهاتین، بەڵام سەرخۆش بوو و خستمان. چارمان نەبوو و دەترساین، بە پشتێنەکەی فریدریک قۆڵمان بەست. لەپڕ دەرگا کرایەوە و وەردیان بە فەنەرەکەدا هاتە ژوورەوە و یەکێکی تری هێنا. هەر لەوێوە کابرا «سی سی، میقاروینا»ی گرتبووە دەم. جارێ وەردیان دەستەیەک کلیلی گەورەی بەدەستەوە بوو، کێشای بە سەر و چاومانا. وتی: «لێرەش پیاو ڕووت دەکەنەوە، قەدەرێکی لێداین و ڕۆیی.» ئینجا چووم بۆ لای ئیتاڵییەکە و وتم با ئەویش لەگەڵ ئینگلیزەکە یەک نەکەوێ وتم: «بۆنەسرا، سینیۆر.» یەعنی ئێوارەباش، زۆری پێخۆش بوو، وتی: «تاباکۆ.» زانیم داوای تووتن دەکا، بەرەو ڕووی ئینگلیزەکەم کردەوە، دەستی برد بۆ کیسەتووتنەکەی و نەیدایە. چوون بە گژ یەکدا، ئێمە ئینگلیزەکەمان بۆ گرت تا کیسەتووتنەکەی لێ سەند، قەندەیەکی لێ پڕ کرد و کیسەکەی دایەوە، ئیتر دەنگی نەکرد. ئینجا مایەوە سەر ئاگر، هیچمان شخارتەمان پێ نەبوو، لە بنمیچەکە لەمپایەکی بچکۆلە دەسووتا، دەستمان نەی دەگەیشتێ. بە هەموومان قەناعەتمان بە ئینگلیزەکە هێنا، چوومە سەر پشتی و بۆرشیەی لامپام دەرهێنا. سا قەندەم داگیرساند و ئینگلیز لەپڕ مێشی هاتێ و خۆی ڕاوەشاند و منی خستە خوارێ و لامپایش کوژایەوە و نەوتەکەی بەسەرما ڕژا. وەردیانەکان بە ڕاکردن هاتن، دیسان سەروگوێلاکی ئێمەیان کوتایەوە. وتیان: «خەریکن ڕادەکەن، ئیتر چراتان بۆ داناگیرسێنین، جا بە تاریکی دانیشن.» سەیرێکی زۆر خۆشمان بوو، لە تاریکیدا ئینگلیزەکە دەیوت یو

*ئاڕ ئەینەس*، ئیتاڵییەکە دەیوت *سی سی دورەمیرد*. زۆری پێ نەچوو، یەکێکی تریان بە تاریکی کردە ژوورەوە. *وی وی ئەپسنت*، ئەویش فەڕەنسی بوو. کابرای فەڕەنسی کە بە تاریکیی هاتە ژووری پێی نا بە ئینگلیزا و لێی ڕاست بووەوە و کەوتنە شەڕەزللە. وتم: «فریدریک، با ئێمەش هەرکامێکیانمان هاتنە ڕەت، پیایا بکێشین. سا لەم کێشە و گێرەیەدا، هاتینە ڕاستی پەنجەرە، سەری ئینگلیزی پیا کەوت و پەنجەرە شکا. لە شەققەی پەنجەرە وەردیان هاتن، فەنەریان پێ بوو و هەموو خەتایان کردە مل ئێمە. دیسان قەدەرێکیان لێداین، ئیتر زۆری نەمابوو ڕۆژ بێتەوە، وتیان چی دەکەن بیکەن. مەپرسە بە چ حاڵێ ڕۆژمان لێ بووەوە، پۆلیس هاتن و بردینیانە لای قۆمیسەر و ئیفادەیان لێ وەرگرتین. یەکەم وتیان:

– ئێوە جنکانەن، دۆمن.

– ئەگەر دۆم بووینایە وا بە ئاسانی نەدەکەوتینە داوی ئێوەوە.

– ئەم پارەیەتان لە کوێ بوو؟

– لە میونخ شەوێک ئاهەنگمان بۆ *یۆهان برۆمەر* کردووە، ئەو پێی بەخشیوین.

– ئۆف زۆر چاکە، ئەگەر ئێوە لە ماڵی ئەو پیاوە بووبن، ئەوا بەرتان دەدەین.

– چۆن دەزانن ئێمە لەوێ بووین.

– بە تەلگوراف دەپرسین.

- تەلگوراف کێیە و چۆن دەگاتە میونخ؟ ئێمە دەزانین میونخ چەند دوورە، خۆ ئەو لە ئێمە ئازاتر نییە.

قۆمیسەر توورە بوو و وتی:

- قەشمەریمان پێ دەکەی؟

- نەوەڵا.

- ئێوە کە بە ڕێدا هاتن، ناوبەناو نەتاندی دار داچەقاوە و تەلی بە سەرەوەیە؟

- بەڵێ، وەڵڵا دەمبینین، بەڵام وامدەزانی ئەوە بۆ ئەو زەویانەیە تا کەس بە ناویانا نەڕوا. چونکە لای ئێمە لە دەوری زەوی دار دادەچەقێنین و تەلبەندی دەکەین.

ئینجا ئێجگاری توورە بوو، ئێمەی کردەوە بەندیخانە. دەمی ئێوارە بانگیان کردینەوە. ئینجا بە پێکەنینەوە بەرەڵای کردین و پارەکەیشی داینەوە. وتم: «بۆم بژمێرە بزانم تەواوە.» دیسان کەر تڕیە برایەتیمان و توورە بوو، وتی: «بۆچی تۆ بە ژمارە داوتە بە ئێمە؟» وتم: «نەخێر، هێشتا خۆشمان نەمان ژماردووە.» وتی لاچن لە پێشچاوم، ئیتر هاتینە دەرێ. تا تیامانا بوو ڕامان کرد، خەڵکی کەوتنە دوومان. وتم فریدریک با دەستێ جل بکڕین خەڵکی بە پیاومان بزانن. منداڵێ گوێی لێبوو، وتی: «وەرن با بتانبەمە موغازەی جل.» پێشمان کەوت و بردینییە موغازەیەک. وتی: «تاقمیان دەوێ.» خۆی ڕۆیی و کابرا چوو تامێ جل و قایشی وڵاخی عەرەبانەی بۆ هێنایین. توورە بووین و وتمان خۆ وڵاخ نین. وتی:

- بۆچی ئێوە عەرەبانەچی نین؟

- نەخێر.

- کەواتە بۆ خۆتان باشە!

لەو قسەیەک و لە ئێمە قسەیەک، چووین بە گژ یەکدا. دیسان پۆلیس پەیدا بوو. وتی:

- خۆ ئێوە ئێستە لە بەندیخانە هاتنە دەرێ.

- چی بکەین؟ هاتووین دەستێ جل بکڕین، ئەم پیاوە تاقمی ولاخمان دەداتێ.

پۆلیس پێکەنی و بردینییە موغازەی مۆدێل و هاتن بە پیرمانەوە و جگەرەیان داینێ. وتیان:

- جلی چۆنتان دەوێ؟

- لەوانەی پیاوەکانی ئەو شەوەی ماڵی یۆهان.

وتیان باشە. ئەم جلانەیش لە فابریقەی یۆهان کراون، دەستێ جلی بالێیان بۆ هێنایان.

## پێشەکی

کاتێ دەستم کرد بە ڕۆمانی کەمانچەژەن، دڵ و دەروونم گەش و ڕوون بوو. هەموو کەس ئارەزووی قسەی خۆش و پێکەنین و خۆشڕابواردنی دەکرد. بۆ بەرگی دووەم زۆر کەس ڕووی لێ دەنام. ئەوسا دەستم نەدەڕۆیی، تا دەهات کاغەز و مەرەکەب و خواردەمەنیش گران دەبوو، ئیتر وتم ڕابوردا ئەو کتێبەم بۆ تەواو نابێ.

لەم چەندانەدا ڕۆژێکی خۆش بە هەوای دەشت چوومە کەناری بەندەکەی ژوور ماڵی خۆمان، لەوێ نازەنینێک شوێنێکی شاعیرانەی هەڵبژاردبوو. لەناو ئەو چیمەن و گوڵزارەدا کتێبێکی بە دەستەوە بوو و دوو منداڵیش ئەمدیو و ئەودیویان گرتبوو. وەک دووباڵی پەری، تیشکی خۆرەکە دابوویە ڕوومەت و گەردنی و لەوێوە لەسەر کاغەزی کتێبەکە بریقەی دەدایەوە. خۆ من بە ناو و داو پیرم، بەڵام لە ڕاستی ئەو جوانییە عەشق و جوانییەکم بۆ گەڕایەوە، گڕی دام و گڕی بەردایە دڵم. هێزی پێم نەما، خۆم دا بەسەر گاڵۆکەکەما و بە لایەوە هەڵوەستام. مەولەوی دەفەرموێ (عاشق بە سەد ساڵی بلووغی دەبێ.) تا ئەو دەمە، دەم و زیو و سینەی وام نەدیبوو. نەمناسی، تووەمەز ئەو منی دەناسی. لە بەری هەستام، ئیختیار بێ ئیختیار بوو بە شاعیر. دەمویست بیدوێنم. پرسیم: «لە کوێوە کەوتیتە ئەم چیمەنە؟» من وامزانی دەڵێ لە بەهەشتەوە، وتی لەسەر قەبرانەوە. نوکتەی مەولەوی و ئامینەخانی لە ژیاندا دیبوو، منیش خاوەنی ڕۆحی مەولەویی

بووم. وتم: «ئەی بۆچی؟» لە ئامینەخان کە مەولەوی وتبووی ئەی بۆچی؟ یەعنی تۆ چوویتە سەرقەبران بۆچی مردووەکان زیندوو نەبوونەوە، ئەویش وتبووی ئەهلی دڵی وەک تۆیان تیا نابوو.

ئەم بە شێوەیەکی بەخۆداڕاپەرموویی وای گەیاند کە ئەوەتا من تۆم زیندوو کردۆتەوە. ڕووخسار و گوفتار ئەمەتا، منیش بۆ بیانوو دەگەڕام کە بیدوێنم. وتم: «ئەوا تێگەیشتم. ڕۆحی مەولەوی بۆ تۆ باشتر ئەژی و بە شیعر دەدوێی، کەوابوو تێم بگەیەنە نووری مانگ لەو ڕۆژەوەیە، بەڵام مانگ بە شەو بە شەوقە، من مانگ لە ڕۆژدا دەبینم، ئەمە چییە؟»

وتی: «قوربان، شاعیر نابێ لە فەلەک بدوێ، هەرچی شاعیرێک کە تەشبیهی جنسیی لەتیفی بە مانگ کردووە هەمووی سەهوو بووە. چونکوو مانگ کوڕە، شەوقی لە ڕۆژەوەیە، یەعنی سۆز و عەشقی کوڕ لە کچەوەیە. بەڵام ئەمە واتای کۆنە و سۆز و عەشقی نەماوە، ئێستا پارە و سوارە باوە. منیش ئاوێنەم نییە، مەگەر تەماشای دڵی تۆ بکەم. شاعیران زۆریان خەیاڵین.»

زۆرتر نەدەلوا ڕاوەستم، ویستم بڕۆم و وتی: «نەتزانی ئەم دوو کتێبە چین وا هێناومن لەم شوێنە شیرینەدا دەیانخوێنمەوە. یەکێکیان مەولەوییە و ئەوی تریان کەمانچەژەنە. مەولەویم تەواو کردووە، بەڵام کەمانچەژەن مەراقێکی تووش کردووین نابڕێتەوە. مەگەر تۆ بۆمان تەواو بکەی بەو سۆز و شێوە شیرینە.» هیچ چارم نەما و بەڵێنم پێدا. ئەوا بە یاردەی خوا دەستم پێکرد. ڕەنگە ئەو لە مەراق

دەرکەم، بەڵام مەراقی چاک بۆ من ماوەتەوە کە نەمزانی کێیە!
ئێستایش هەر دەپرسم و نازانم کێیە، هیچ شک و شوبهەم نەماوە کە پەری بووە. ئەگینا سۆراخم دەکرد، خۆ من کێوی قافم دیوە و چاوم بەو هەموو گورجییە پەریانە کەوتووە، لە وێنەی ئەو نەبوون. وا بەرزە کە وێنەی ناکەم.

# فەسڵی یەکەم

**ڕەندی بە پیریی**

ئێمە سەعادەتی ئەلفرێد مۆلەر و یاوەرەکەی، فریدریک شۆللەرمان لە موغازەی کۆستیوم، یانی تاقمی چاکەت و پانتۆڵیان بەجێهێشتبوو، ئەگەر تا ئێستا جل و جەواڵمان بۆ بکڕینایە، ئەوا جلەکانیان دەمێک بوو دڕابوو. بەرەکەت دا تازە شاگردەکە چوو دەستێ جلی بالێی بۆ هێنان. جا بێینەوە سەر ئێمە با ئەلفرێد خۆی بیگێڕێتەوە.

کە جلەکانی هێنا، موغازەچییەکە بردینییە ژوورێکی تاریکەوە و وتی لێرە خۆتان ڕووت بکەنەوە کەس چاوی لێتان نییە. تێفکریم لەودیو پەردەکەوە شاگرد فیقەفیق پێدەکەنن. من تووڕە بووم و تەمام بوو ڕووت نەبمەوە، موغازەچی بە زمانێکی خۆش وتی: «ئەم ڕووتبوونەوەیە هیچی تیا بەستە نییە، هەرچی بێ بۆ جلکڕین لێرە خۆت ڕووت دەکەیتەوە، خۆ ئێوە ژن نی هیچتان دەرکەوێ.» تێفکریم فریدریک لە پێش منا ڕووت بووەوە، شەرمم شکا. ڕووت بوومەوە و تەنها دەرپێکەم لەپێدا بوو، بە جارێ شاگردەکان دەستیان کرد بە پێکەنین. ناجسنێکیان وەک بڵێی سەیری تیاترۆچی بکا بە براوە، چەپڵەی بۆ لێدام. من لە کابرای موغازەچی تووڕە بووم، کەچی بە پێکەنینەوە دەستی برد دانتەلە و فیتسحی دەرپێکەی پێ نیشان دام. توومەز ئەو شەوەی لە ماڵی یۆهان

پیس بووبووم، کچەکە دەرپێی خۆی دابوومێ. بە دەرپێی ژنانەوە هاتبووم، هیچ لە بیرم نەبوو دەرپێ بگۆڕم. کاری ڕاست بێ، شاگردەکانی دوورخستنەوە و چوو دەرپێ و فانیلەی پیاوانی بۆ هێنام. ئەوانەم گۆڕێ و لەسەر ئەوەوە کراسێکی قۆڵدارییان لەبەر کردین، بەڵام یەخەکەی زۆر ڕەق بوو و ملم دانەئەنەوییەوە. وتم: «بابە من ئەم تەوقی لەعنەتەم ناوێ.» هەرچەند هاوارم کرد هەر دەیوت: «ئۆف یۆف چەند تەتەیە.» ئینجا پانتۆڵی لە پێکردین، کە هێلەک و فیراقەکەمان لەبەرکرد بردینیانە بەر ئاوێنە. لە پشتەوە ئەوەندە درێژ بوو، وەک کلکم لێ ڕوابێ وابوو. دەستم برد دایکەنم، وتی: «نەکەی نامەرد! پیاوی زۆر گەورە ئەمانە لەبەر دەکەن، تۆ خۆت بچووک مەکەرەوە.» ئیتر خۆم نەشکاند. وتم: «حسابی بکە، جلەکانمان بایی چەندە؟» وتی جارێ زۆرتان ماوە.

- نیازت وایە هەموو پڕەپاتاڵ و جل و جەواڵی موغازەکەتمان بە سەردا ساغ بکەیتەوە؟

- دە باشە، ئەی بە سەری ڕووتەوە دەگەڕێن؟

لێکم دایەوە ڕاست دەکات، وەک ئەم زەمانە نییە بە سەری ڕووتەوە بگەڕێین. ئەوسا هەرچی سەری ڕووت بووایە، دەیانوت سەری ڕووت بە دوای کەر!

دوو شەبقەی درێژی سلیندریان بۆ هێناین، حسابم کرد بایی لیرە و نیو بوو، بە خشیمیان زانین، بۆیە یەک و دوو پارەیان لێ سەندین. گوایە ئیکرامانە یەکی باستۆنێکیان بە خۆڕایی داینێ، ئینجا وتمان: «کەواتە جلە کۆنەکانمان لێ بکڕن.» وتیان: «کۆنەفرۆش نین. بەڵام بەم شاگردەدا

دەیاننێرم بیانفرۆشێ.» ئێمە لەوێ دانیشتین و شاگردەکە جلەکانی برد، قەیرێکی پێ چوو و هاتەوە نیو لیرەی بۆ هێناین، ناچار وەرمان گرت و هاتینە دەرێ.

بەو جلانەوە توورەکەی کەمانەکەم لە بن باخەڵدا بوو و پێمان نایە کۆڵان و خەڵک دەستی کرد بە پێکەنین. ئەی دوایت ببڕێ تەرپیر، لە هەموو شوێنی ڕۆحی حازرە و پێمان پێدەکەنێ. گوێمان نەدایە، چووینە ئوتێلێک و وتم: «هۆدەیەکی دوو کەسیمان دەوێ.» بردیانین لە هۆدەی بەردەرگاکە قەیدیان کردین و لە قاتی سەرێ هۆدەیەکی تریان نیشان داین. چووینە ژوورێ کەمانەکەم بە سینگێکدا هەڵواسی. نەختێ دانیشتین و ماندوویەتیمان حەسایەوە، وتم: «فریدریک با نەختێ بچینە دەرەوە بگەڕێین.» بە زۆر بە خواهیشت ملی دا، بەڵام وتی: «ئەلفرێد تۆ بۆ کورێنیی هاتووی یان بە شوێن یارتا بگەڕێیت؟»

هەناسەیەکەم هەڵکێشا و وتم: «بەخوا ڕاست دەکەی.» وتی: «ئەو کاتبەی ناوی ئێمەی نووسی پیاوێکی ناسک و زیرەک دیار بوو، با بچین بزانین چیمان پێ دەڵێت.» چووین سڵاوێکمان کرد و لەبەرمان هەستا، جا وتی: «ئەمر بکەن.»

وتم:

- ئێمە غەریبین و ئافرەتێکمان لێ ون بووە، بە شوێن ئەوا دەگەڕێین.

- تەگبیرمان چییە؟

- تەگبیر ئەوەیە ئیعلان بدەن بە ڕۆژنامە.

- ڕۆژنامە چییە؟

ئەحوالی ڕۆژنامەی تێگەیاندین. وتم: «کەواتە کاغەز و قەڵەم و شووشەیەک مەرەکەبم بدەرێ، خۆم ئیعلانەکەم دەنووسم.» قەڵەمێک و پەڕەیەک کاغەزی دامێ و دوێتی نایە بەردەمم، دەستم بە نووسین کرد: «ئەلفرێد مۆلەر ئەفەندی لە هەرێمی باویرا، لە دێیەکی زۆر بچووک زۆر دەمێکە لە دایک بووە، نەخێر! دایکی نەماوە و لە باوکیشی بووە. هەژدە ساڵ لەوێ ژیاوە، دوایی باوکی دەری کردووە. لە ڕێ بە خزمەت خانمەکەی و تەڕپیر گەییوە و لەگەڵ خۆیان بردوویانە. ئەو دوو ئافرەتە و عەرەبانەچییەک و چوار بارگیری لێ ون بووە و بە شوێن ئەواندا هاتۆتە *ویانە*، چونکە بڕیار وابوو ئەوان بێنە ویانە. ئەلفرێد مۆلەر ئەفەندی کەمانێک لێدەدا هەرچی گوێی لێ بێت عاشقی دەبێت. زاتەن ئەوانیش هەر لەبەر کەمانەکەی خۆشیان دەوێت. ئێستا هاتۆتە ویانە، جلەکانی ئەو شەوەی مالی یۆهانی لەبەردا نەماوە تا گاڵتە بە دەرپێکەی بکەن، ئێستا بە هێلەک و شەبقەی سپلندەرەوە پیاوێکی ترە. کەس نایناسێتەوە و کەمانەکەی لە ژوور سەری هەڵواسیوە و بە شوێن ئەو ئافرەتانەدا دەگەڕێ کە لێی ون بوون. تاکوو نەیاندۆزێتەوە، ناویان ناڵێت. نیهایەت ئەمەندە دەڵێم خانمەکەم کچێکی زۆر جوان و شیرین و قسەخۆشە و ئافرەتەکی تر تەڕپیرێکی مۆن و دەنگزلە و هەمیشە پێدەکەنێ و وەک ئەوەی بەرد بە بەرددا بدا. ئەم دوو ئافرەتە هیچیان لە یەک ناکەن و بە تەقدیری خواش هەمیشە بەیەکەوەن. عەرەبانەچییەکەیان زۆر تووڕەیە. ڕەنگی بارگیرەکانم بیرچۆتەوە بەڵام عەرەبانەکە لە پشتەوە جێی خزمەتکاری هەیە، ئەلفرێد ئەفەندی لە ئوتێل

دەبێ، هەر کەسێ ئوانی دۆزیەوەتەوە، مژدەی خۆی بسێنێ. هۆووووووو.»

کاتبەکە لە پشتمەوە سەیری نووسینەکەی ئەکرد و جار جار بزەیەکی ئەگرت، وتی: «کاکە ئەم ئیعلانە دووردرێژە پارەی زۆری ئەوێ.» وتم قەیناکات. دامێ و ئەویش ناردی بۆ غەزەتە.

چووینە ژوورەکەی خۆمان و لێی ڕاکشاین، سا زۆری پێ نەچوو بە پەلەپیتکە یەکێ لە دەرگای دا. وتم: «دانەخراوە بۆچی لێی ئەدەی؟» بیرم کردەوە و گارسۆن هاتە ژووری *ڕووەدانس*ێکی کرد و کڕنووشێکی برد. وتی: «سەعادەتی ئەلفرێد ئەفەندی تەنەزول ئەفەرموێ تەشریفتان بێتە خوارێ بۆ سالۆنی نانخواردن.»

نان ئەخۆن! وتمان باشە. هەڵساین چووینە خوارێ، سالۆنێکی گەورە بوو، پێمان نایە ژوورەوە و هەموو دەستیان کرد بە پێکەنین. فریدریک وتی: «ئەلفرێد، خۆ تەڕپیر لێرە نییە، ئەمانە بۆچی پێدەکەنن؟» نیازمان بوو بگەڕێینەوە، گارسۆن بە ڕوویەکی خۆشەوە وتی: «ئێوە بە شەبقەوە هاتوونەتە ژوورەوە، شەبقەکان بدەن بە من و خۆتان فەرموون دانیشن.» چووین لە کەنارێکەوە لەسەر ساحەیەک دانیشتین، یەکێک هات و وتی:

- چی مەیل ئەکەی؟

- چیتان هەیە؟

هەر لە خۆیەوە ئەویش پێکەنی، چوو کاغەزێکی درێژی هێنا و دایە دەستم وتی: «ئەمە لیستەیە.» فریدریک نەخوێندەوار بوو، من خوێندمەوە و ئەو گوێی گرت. نووسرابوو بیفتک.

- چییە؟

- منیش نازانم.

- لایبە.

- ڕۆزبین.

- چییە؟

- نازانم.

- فرێی دە.

- ئاوی گۆشت!

- گۆشتی تیایە؟

- با لە گارسۆن بپرسین.

- نەک عەیب بێت.

- بۆرەکی ئینگلیزی؟

- ماڵی ئینگلیزم ناویَ.

- زەلاتەی ئیتالی.

- ها، ئەمە باشە.

گارسۆن لە پشتمانەوە وێستاوە و توند دەمی خۆی گرتبوو، خەریک بوو ئەویش پێبکەنیَ. لێی توند بووم وتم:

- تۆش بێئەدەبیمان پێدەکەی؟

- ئەستەغفرولّلا، باوێش ئەدەم!

- سا کەواتە برۆ زەلاّتە بێنە.

- قوربـــان، بە زەلاّتە تێـــر نـــاخۆن، چێشـــتێکی لە پێشـــەوە بخۆن.

دیسان لیستەکەی دایەوە دەستمان.

- فیلەتو؟

- گۆشتی فیل چۆن ئەخوریّ!

- فڕووج.

- ئا گۆشتی مریشک خۆشە، ئەویش خۆشاوی سێو.

- ئا ئا، ئەویشی بە سەردا ئەخۆینەوە.

بە گارسۆنمان وت:

- دوو قاپ زەلاّتە، دوو قاپ خۆشاوی سێو، دوو مریشکی سوورۆکراویشمان بۆ بێنە.

- هەموویان بە جارێک بهێنم، یا یەکە یەکە؟

- هەموویان بە جارێک بهێنە، با ئەوەندە چاوەڕوانی نەکەین و دلّنیابین.

گارسۆن ڕۆیی و لەوسـەرەوە سینییەکی هێنـا، شـەش قـاپی لەسـەر بوو و لە بەردەممانـدا دایـنا. سـا کە ئەو ئەمـانەی دانـا، سەیر ئەکەم ئافرەتەکان هەمـوو کەوچک و چەتاڵیان داناوە و سـەیری ئـێمە دەکەن، هێشـتا ئـێمە هیچمـان نەکـردووە، لێمـان

بوونە جاسوس. تێفکریم گارسۆن باقەیەک کەوچک و چەتاڵ و کێرد و دوو باگردێن شووشـەی هێناوە تا کەوچک و چەتاڵی لەسەر دابنێین. بەخوا ئێمە دەستمان بۆ هیچیان نەبرد، قۆڵمان لێ هەڵماڵی و بە چنگ بەربووینە زەڵاتەکە. وتمان با جارێ لە پێشەوە ئەمە بخۆین و ئیشتیهامان بکرێتەوە. زەڵاتەکە سرکەی زۆری پێدا کرابوو ترش بوو، خۆشـاومان بە کاشـییەکە بە سەرا هەڵقۆراند تا دەممان شیرین بێ. خۆش بوو! دەمێکم بۆ تەقاند لەپڕ لە هەموو لایەکەوە قاقای پێکەنین پەیدا بوو، ئاوڕم دایەوە هەموو بە ئێمە پێدەکەنن. وتم: «فریدرید، چی بووە وا دیسـان بـووین بە مەخسـەرە.» وتـی: «نـامەرد، ئابڕوویـان بـردین، وابـزانم هـی ئەوەیە کە بە کەوچـک و چەتـاڵ نەمانخوارد.» با ئێمەش دەست بدەینە کەوچک و چەتاڵ. ڕۆن و زەیتوون و ترشاوی زەڵاتەکەمان بە دەستەوە بوو، پەچەیان بۆ جوانی لەناو پیاڵەی ئاوخواردنەوەکەدا وەک نەفەر چین چین قەد کردبوو، هێنامان دەستمان پڕ سڕی و چەتاڵمان گرت بە دەسـتەوە. خـۆ تەنهـا مریشـک مـابوو، فریـدریک نـووکی چەتاڵەکەی لە مریشک گیر کرد و بە جارێ هەمووی هەڵگرت، بە گـاز تێـی بەربـوو و منـیش وتـم بەخـوا ئەمە باشـە، بـۆچی هەمووجارێ لێی بپڕێنم و دای بنێمەوە. وەک ئەو چەتاڵەکەم تێچەقانـد و هەڵـم بـڕی، تـوومەز بـاش لـێم گیـر نەکردبـوو، لە چەتـاڵ بەربـوو و پەڕیـیە خـوارێ. تـوولەی مادامێـک لە بـن مێزەکەدا بوو، پەلاماری دا و ڕفاندی.

فریـدریک هـات تـوولە بترسـێنێ و پێـی فـڕێ بـداتەوە، بە دەنگێکی بەرز وەک گەماڵ لە توولە وەڕی، حەپ حەپ، توولە ترسـا و مریشـکەکەی فڕێـدا و بە جـارێ لێیـان کـردینە

چەپڵەڕێـزان. ئینجـا تـوولەش لێمـان کەوتە وەڕیـن، ناچـار هەڵسـاین، ڕامـان کـرد و چـووینەوە ژوورەکەی خۆمـان. گارسـۆن کە شـەبقەکانی بـۆ هێنـاینەوە، سـەری پـارەی خواردەمەنیشی لێسەندین. شەوێ زۆرمان برسی بوو، سەد ئاواتم بە تـوورەکەکەی هەوەڵ ڕۆژم خواسـت کە لە مـاڵی باوکم قنچکەباسـوورمە و لەتکەهەرمـێم تێکردبـوو. بـۆ بەیانییەکەی فریدریک وتی: «ئەلفرێد، ئیتر من ڕووم نـایە جارێکی تر بچمە خوارێ.» منیش وتم: «ڕاست ئەکەی، جارێ من زۆر ماندووم، بەیانیش زوو هەڵدەستم، با بنووین.»

سا لەسەر جێ ڕاکشاین و فریدریک وتی: «کاکە شەوقی لامپاکە لای ڕاستی چاومە، فێـری چـرا نەبـووم و خەوم لێناکەوێ، با نەختێ کزی بکەین.»

لەمپا لە ناوەڕاستی سەقفی ژوورەکەیە و هیچمان نایگەینێ، چی بکەین! مێزێکی خڕیان دانابوو، سوراحییە ئاو و پەرداخی لەسەر بوو. شووشە و مووشەمان لابرد و مێزمان کێشایە ڕاستی لەمپا. ئەوەندە خێرا خۆم هەڵدایە سەر مێز، دەستم نەگەیشتە ڕاستی پڵێتەی لەمپاکە تا کزی بکەم. نەختێ خۆم هەڵدا، دەستم گەییە ڕاستی دووگمەی پڵێتەکە و بامدا. لە پەلەپەلیاندا ئەوەندەم بادابوو بە جارێ کوژایەوە، لە تاریکیدا مـاینەوە و بە پەلەکوتێ دەرگاکەم دۆزییەوە، چوومە دەرەوە بۆ ڕاڕاوەکە، چرای لێ ئەسووتا. بانگم کرد: «هۆو، کێ لەوێیە؟»

دەنگێکی ناسک وەڵامی دایەوە و وتی: «فەرموو.» هاتە پێشەوە ڕوانیم ئافرەتێکی جوانە، شەرمم لێهات بڵێم وەرە

چرامـان بـۆ داگیرسـێنە. وتـم: «خزمەتچـی ئـوتێلم ئەویسـت.» وتـی: «فەرقـی نیـیە منـیش فەرمـانبەرم.» عەجـایەبم لێهـات ئافرەت بە شەو ئێشکچی ئوتێل بێ. وتم: «خانم، تۆ هیچ ئیشی ترت دەست ناکەوێ وا بە شەو بە دیار ئەم پیاوانەوە ئەبی؟»

- خۆ مشتەرییەکان هەموو پیاو نین، ئافرەتیشیان تیایە.

- ئەی ئەگەر پیاوێکی بێژن و بێکەس لێرەدا بێ، بەزەیتان پیا نایەتەوە؟

- ئێمە بەزەییمان پیا بێتەوە چی بڵێین، خۆ ناچینە باخەڵیان.

- چونکـوو بێناموسـیمان لـێ ببیـنن، دەسـتبەجێ جوابمـان ئەدەن.

لەبەر چـرا، سـنگ و گەردنـی وەک ئەڵمـاس ئەدرەوشـایەوە. قەت وا نەبووم، بەڵام نازانم عاشقی جلەکانم بوو، وەخـت بـوو بۆی شێت ببم.

- ئینجـا ئێـوە ئەگەر بە دزییەوە ڕەحـم بە کەسـێ بـکەن و نیوسەعات لەگەڵی ڕابوێرن، کێ پێی ئەزانێ؟!

- خارێ گوم نابێ؟ دووەم فێر ئەبیت.

لەم گفتوگۆیەدا بووین، دەنگێکی بەرز هـات. وتـی مـن بانـگ ئەکەن بە دوعـا. ڕای کـرد ڕۆیـی و مـاوەیەک لەبەر سـەرما وەستام و نەهاتەوە، ناچار چوومە ژوورەوە، بە پەلە جێگاکەم دۆزییـەوە و بـانگی فریـدریکم کـرد. لە هەزار سـاڵان ڕاسـت بۆتەوە، منیش سەرم کرد بەژێر جێگاکەدا و ڕاکشـام، بەڵام تـا درەنگێ ئەو سنگ و گەردنەم لەپێشچاو بوو.

خەوم لێ نەدەکەوت، ناچار ئاخری نووستم، جا دیتە درەنگ نوستبووم، بەیانی درەنگ خەبەرم بۆوە. نەوەڵام خەبەرم نەبووبووەوە، کاتبەکە هەڵیساندم. غەزەتەیەکی بە دەستەوە بوو و وتی وەڵامیان داویەتەوە، لە خۆشیانا گەشکەدار بووم. دەستم کردە ملی کابرا و توند گوشیم، هەر ئەوەندەی پێکرا غەزەتەکەی فڕێدا و ڕای کرد. بۆی دەرچوو، ئینجا هاتمەوە ویژەی فریدریک کە نوستبوو. خۆم دا بە سەریا و وەختەبوو هەموو پەراسووەکانی بشکێنم. چاوی کردەوە و وتی: «وەحە، وەحە. بۆچی وا بەلەسە بوویت؟» وتم: «کورە ڕاست بەرەوە و سەیر کە ئەم غەزەتەیە بخوێنەرەوە.» لە تاواندا بیرم نەبوو کە نەخوێندەوارە، وتی: «کابرا بۆچی عەقڵت شێواوە، ئاخر کەی من خوێندەوار بووم؟»

وتم: «ئەوەتا بۆت ئەخوێنمەوە، گوێت لێ بێت.» بۆم خوێندەوە، نووسرابوو: *ئەفەندی ئەلفرێد مۆلەر، ئەو ژنەی لە دوای ئەگەڕێیت من ئەیناسم، ئەو دوو ژنە کچەکەیان ناوەکەی وشەی پێشەوەی یا دەنگدارە یا بێدەنگە، بەڵای نە کورتە و نە درێژە، ڕەنگی نە سپییە و نە ئەسمەرە، چاوی نە گەورەیە و نە بچووکە، لووتی نە کورتە نە درێژە. ئێوارە وەرە (قاخەوین) لەوێ درێژەی باسەکەت ئەدەمێ.*

کە خوێندمەوە فریدریک سەرێکی لەقاند و وتی: «هێ هێ، بەم خەبەرە میکایلا ئەدۆزیتەوە! جارێ پێم بڵێ وشەی دەنگدار و بێدەنگ چییە؟ ئەوانە چین وا ئەبارێنن و دەنگ ئەدەنەوە.» وتم: «فریدریک، ئەو چەنەبازییەت لە چییە، هەڵسە خۆت کۆکەرەوە با بچین بۆ قاخەوین.» وتی:

- مردووت مریّ، تۆ یەکجاری فرت بەسەر دنیاوە نەماوە، پارچە کازەکە کە ئەلّیی ئەبارێنیّ، وتوویەتی ئێوارە وەرە. تۆ هێشتا هەتاو نەکەوتووە کەوتوویتە سەما.

ئیتر خوا هەقە فریدریک سەرپێچی نەکرد، هەلّسا و شوێنم کەوت. کە چووینە دەریّ، فریدریک وتی: «ئێمە بچینە دەریّ و بکەوینە کۆلانان گوم ئەبین. با یەکێ بدۆزینەوە شارەزا بیّ و ڕابەریمان بکات.» ئێمە لەم گفتوگۆیەدا بووین یەکێ لە دوامانەوە گوێی قووت کردبۆوە. ئاوڕمان دایەوە و هاتە پێش دەممان، شەپقەکەی داگرت و *ڕەوراِنس*ی کرد، کڕنووشێکی برد و وتی: «وابزانم ئەفەندییەکانم تازە تەشریفتان هێناوەتە ئەم شارە و شارەزا نین، ئەگەر ئارەزوو دەفەرموون لە خزمەتتاندا دێم، ئەگەر ڕازی بن ڕابەری دەکەم.» زۆرمان پیّ خۆش بوو و وتمان: «های های وەرە لەگەلّمانا بزانین کویّ خۆشە بچین ڕابوێرین.» وتی: «باخچەی حەیواناتە وەحشییەکان، یانی دڕندەکان خۆشە.» کە وای وت داچلّەکیم و وتم: «برادەر، دڕندەکان پیاو ئەخۆن.» وتی: «نەخێر، زۆر توند بەستراونەتەوە، ناتوانن جم بدەن، سەیریان خۆشە!» وتمان کەوایە با بچینە ئەویّ.

سا ئێمە ئەمەمان وت و نەوت، کابرا گورج عەرەبانەچییەکی بانگ کرد و سوار بووین. کابراش هات لە بەردەممانندا قوت بووەوە، فریدریک پرسی: «بیّ قەیدی بیّ، ناوت چییە؟» وتی: «مۆریسی خزمەتکارت.» نیو سەعات ڕۆیشتین و گەیشتینە بەر دەرگانەیەکی زۆر گەورە، لەویّ دابەزین و پارەی عەرەبانەچیمان دا. مۆریس وتی: «پارە بدە با بلیتی چوونەژوورەوە وەرگرم.» وتمان: «چوونەژوورەوە چییە؟»

وتی: «ئەم هەموو مەسرەف و بینا و پاسەوان و خۆرانی حەیواناتە خۆڕاییە؟» پارەمان دایە و بلیتی وەرگرت، کە چووینە ژوورەوە هەتا چاو بڕ بکا باخچە بوو. لە پێشدا وامزانی هیچ نەبێ بەقەدەر باخچەی شاتووەکەیە، کەچی دە ئەوەندە زل کرابوو. لەسەر دارێک تەیرێک هەڵنیشتبوو و تەماشای خەڵکی دەکرد، پرسیم: «ئەمانە چین؟» وتی: «ئەمانە تووتین، یا باباغاییان پێ دەڵێن و قسە ئەکەن.»

وتم: «دەی ئینشاڵا تەیریشمان لێ دێنیتە زمان!» کابرا وتی: «خۆ ئەمە شتێکی گران نییە، هەر ئێستا ئەیاندوێنم.» چوو بە لای یەکێکیانەوە و ڕووی تێکرد و پێی وت: «بەیانیت بەخێر.» تەیرەکەش دەنووکی داچەقاند و ڕاست و ڕەوان وتی بەیانیت بەخێر.

من لەمە سەرم سوڕما، مۆریس پێم پێکەنی. منیش قینم هەستا و وتم: «وا ئەزانی من ئەمانەم نەدیوە! من لەمە عەجایەبتەرم دیوە، باوکم تووتییەکی هەبوو، جارێ کە کاغەزی بۆ شوێنێک بنووسیایە، سفارشی تووتییەکەی ئەکرد.» مۆریس هیچ نەشڵەژا و وتی: «ڕاست ئەکەی، لێرەش تووتی وا هەیە، ئەو کاغەزەی تووتییەکەی باوکت نووسیویەتی ئەو ئەیخوێنێتەوە.» فریدریک پرسی: «تووتییەکە بە چی ئەینووسی؟» من وتم: «قەڵەمی ئەگرت بە دەنووکیەوە» مۆریس وتی: «هی ئەم تووتییە ئاسانترە، بۆی ڕائەگرن و ئەو ئەیخوێنێتەوە.» کابرا لەبەر ئەوەی پارەی زۆرمان لێ بسێنێ، منی بە درۆ نەئەخستەوە. فریدریکیش باوەڕی پێ نەدەکردم.

ئینجا مۆریس وتی: «با بچین سەیری ورچ بکەین.» وتم: «من ورچ بە بێهێز ئەزانم و نامەوێ بیانبینم. باوکم ورچی کوشتووە و ئەمانە تۆڵەی ئەو ورچەم لێ ئەستێنن.» مۆریس وتی: «ئەمانە لە *تەلینەی ئاسنان*، زیان بە کەس ناگەیەنن.» ڕاستی لە پێشدا ترسام، کە وتی لە قەفەزی ئاسنان چەرەساتم پەیدا کرد. چووین سەیرمان کردن، سێ ورچی بۆر و چوار سپی وان لە قەفەزی ئاسنا. ئینجا لەوێوە بردینییە سەیری فیل. فیلێکی گەورە تەختێکی لەسەر پشت بوو و لە مەیدانا بوو، نەشبەستراببووەوە و دەخلی کەسی نەدەکرد. دوای ئەوە سەیری پڵنگ و ڕێوی و چەقەڵ و گورگمان کرد.

بردینییە مەیدانی باڵندە و مورغیی عەجایەب، عەجیب ماندوو بووبووین. لامان دایە گازینۆیەک و دانیشتین. گارسۆن هات و وتی: «چی ئەمر ئەکەن؟»

مۆریس بە فرسەتی زانی و پێی گوت: «بیرە.» هەر بیرەی هێنا، نای بە سەریەوە و تا بیست و یەک پەرداخی خواردەوە. ڕۆژیش لە ئاوابوونا بوو، پێنج مارکەیەکم نایە دەستی و بڕۆ خوات لەگەڵ. کابرا بە خۆشی خۆیەوە هەستا ڕۆیی و ئێمەش هاتینە دەرێ. لەبەر باخچەکەدا عەرەبانەی زۆر وەستابوون، یەکێکیانمان بانگ کرد و سواربووین، پێمان وت بمان بە *قافەوین*. نیو سەعاتێک ڕۆیشت و لە بەردەم بیرەخانەیەکدا وەستا، دابەزین و گازینۆچی کە ئێمەی بە فراق و شەپقەی درێژەوە لەناو عەرەبانەکەدا دی، هات بە پیرمانەوە و بردیشینە جێیەکی تەنها و لیستەی بۆ دانایین. جا وتی: «چی ئەمر ئەفەرموون؟»

من وتم: «ئەڵێن شتێک بخۆینەوە! بەڵام یەکێک ئێمەی بۆ ئێرە دەعوەت کردووە، ئایا خۆی هاتووە یان نا؟»

کابرا وتی:

- کێیە؟ وا ئێوەی بۆ ئێرە بانگ کردووە.

- کابرا بۆچی تۆ ناوی منت نەبیستووە؟ من ئەلفرێد مۆلەر ئەفەندیم.

- پێخۆشحاڵبووم کە وا ناوی تەشریفتانم زانی.

- تەئەسوف ئەکەم، ناوی منت درەنگ بیست.

- چی بکەم؟ تا ئێستا تەشریفتان ناهاتۆتە ئێرە تا بە خزمەتتان بگەم.

- کوڕە ئەوەی نەشی بینیوم هەر ناوم ئەزانێ. تەنانەت قۆمیسەرەکەی یانەیش ناوم ئەزانێ. لەبەری بکە با بۆت دووبارە بکەمەوە. ئەلفرێد ئەفەندی، تەنها ئەلفرێدیش نا، مۆلەریشی پێوەیە. لە شوێن ژنێک ئەگەڕێم.

- قوربان، دیارە بەخێر ژن دێنی، تۆ خۆت دۆزیوتەتەوە یان من بۆت بدۆزمەوە. ئاسانە تۆ سەری خۆت قورس مەکە، شاگردەکەت لە خزمەتتدا ئەنێرم، عومخانە نزیکە.

- کوڕە کابرا ئەوە دەڵێی چی؟ من بە غەزەتە بڵاوم کردۆتەوە.

- ها ها، ئینجا زانیم، هەتا ئیعلانەکەیان لە غەزەتەدا خوێندەوە. هەموو موشتەرییەککان بە پێکەنینەوە دەست بە دەست ئەیانگێڕا.

- عوزر لە قەباعەت خراپترە.

تەمام بوو لێی دەم. بەس فریدریک کەوتە بەینەوە و وتی: «بابە جارێ سەرو بیرەمان بۆ بێنە، هەر کەسێکیش هەواڵی ئێمەی پرسی بیهێنە لامان.»

ئینجا وتی: «بەسەرچاو، کاری تۆ ڕاست بێ شووشە و مووشەمان نەشکا.»

کە ئەو ڕۆیی من بە فریدریکم وت:

- ئەی فریدریک، وا من میکایلام دۆزیەوە، ئینجا بۆ خۆت چی ئەکەی؟

- خوا بکا بە ئاسانی و بێ شەڕ تۆ ئەو بدۆزیتەوە، من لە پێشدا چۆن دەمگوزەراند، هەروا ڕەحەتتریش ڕای ئەبوێرم.

- نەخێر فریدریک، میکایلام دۆزیەوە، جێی تۆش ئەکەمەوە. لە پێشدا منیان کردبوو بە گومرگچی، ئێستا من تۆ لەسەر ئەو ئیشە دادەنێم.

لەم گفتوگۆیانەدا بووین، گازینۆچی هات و وتی:

- پیاوێک لە شوێن ئێوە ئەگەڕێت.

- ئەی بۆچی نەتهێنا؟

- چووزانم! پەتیارەیەکی ڕووت و قووت وتم بەڵکوو زاتێکی گەورەی وەک تۆ ئەو لەم شوێنەدا قبووڵ نەکا.

- ئامان زوو بیهێنە!

هێنــدەی نەبــرد ڕوانــیم ڕووتەیەکــی ڕووت لە قیــافەتی هەوەڵجاری مـن خراپتـر هـاتە پێشـەوە و دانیشـت. جـا وتـی: «ئەفەندی من *مایەرم.*» دانیشت و دانەنیشت هەروا لە خۆیەوە انگی کـرد کـوڕە گارسـۆن بیـرە، بەڵام «سـپانن» غەشـی تیـا نەبـێ، *دەبل* لە پەرداخـی دوومەنـی بیرەیـان بـۆ هێنـا. نـای بە سـەریەوە و قـوڵتەیەک لە قـوڕگیەوە هـات و بە جـارێ ئەو پەرداخە دووپەرداخیــیە چــووە خــوارەوە. بــۆکرووز لەنــاو جەرگیەوە ئەهات، دیسان بانگی کرد:

- قەدەحێکی تر.

ئەویشیان هێنا و خواردیەوە. ئینجا پێم گوت:

- تۆ جارێ داوای ئێمە بدە بە دەستەوە، لە پاشانا ئەتوانی تا ورگت ئەگرێ بخۆیتەوە، ئێستا تـا هۆشت بە خۆتەوەیە پێم بڵێ لە کوێیە؟

- کێ لە کوێیە؟

- کورە خوا بتگرێ میکایلا؟

- کوڕە خوا بتگرێ میکایلا کێیە؟

- ئەی ئەم مەکرە چییە، تۆ نەتنووسیوە کە ئەیناسی؟

- بەڵێ من نووسیومە ئەیناسم و لەسەر قسەی خۆمم.

- ئەی بۆچی وا ئەڵێی؟

- هەروا بە خـۆڕایی. بـاوە مـن پیـاوێکی هەژارم، تەماشـای سەر و پاتەڵاکم بکە و ئینجا بڵێ خەبەرم بدەرێ.

- باشە تێگەیشتم پارەت ئەوێ، چەند قروشت بەمێ؟

- ئۆف خوا موبارەکت نەکا، بە قروش ئەدوێ.

- ئەی بە چی بدوێم؟

- بە لیرە.

- ئێ با لیرە بێ، چەنت بەمێ؟

- خۆ لەگەڵ زاتێکی وەک تۆ گەورە نەخوازەڵلا عاشقیش بێ باسی کەم و عەشەرات بکرێ، ئەبێ بە میئات بدوێین.

فریدریک نەیهێشت و بەر لە من وتی: «تۆ جارێ من تێبگەیەنە عەشەرات و میئات چین؟ لە کوێوە هاتوون؟» وتی:

- وا دیارە تۆ لە خوێندندا پیادەی پێپانی. برۆ بخوێنە ئینجا وەرە لای من بدوێ. ئەفەندی وا دیارە خوێندەوارە و ئەو ئیعلانە جوانە خۆی نووسیویەتی. چونکە وریا نەبێ، ناتوانێ بەو جۆرە بنووسێ.

ئینجا ئەمجارە خۆم هاتمە مەیدان و وتم: «ڕاست و ڕەوان بڵێ چەندت ئەوێ؟» وتی: «هیچ نەبێ نیوە میئات.»

لێکم دایەوە من لەم مژدەیەدا هەتا زیاتر ببەخشم لای میکایلا قەدرم زیاتر ئەبێ، بەڵام ڕووی نەبوونی ڕەش بێ. خۆ بەم جلانەشەوە و لەم شوێنە قەرەباڵغەدا بشڵێم نیمە شوورەییە. چی بکەم، چی نەکەم. مات بووم و لێم ئەدایەوە، میر وتی:

- ئاغا بۆچی وا زوو کڕ بوویت؟ پیاو کە دەوڵەمەند بوو درەنگ پارەی لەدەست ئەبێتەوە، مەگەر وەک جەنابتان

هەوایەکی عەشقی لە کەللەدا بێ. دەرکی دڵ و دەرکی کیسە پارەی بۆ ناگیرێتەوە.

زۆر توورە بووم و وتم:

- بە عەقڵی ناتەواوی تۆ گوایە من ملیۆنەرم و عاشقم؟ ئافەرین چاکت هەڵهێنا، وا برۆی ئەدۆڕێنی.

کە وام وت نەختێ شلی کردەوە و وتی:

- هەرچەندە من زۆر هەژارم، بەڵام ناچار کەمێ تەنزیلاتتان بۆ دەکەم.

- چەند.

- تا پێنج لیرەی بە بەرەوەیە! با چل و پێنج بێ.

- کیسەیەکی پان و درێژت بۆ هەڵدووریوە، نەختێ تەسکی کەرەوە.

ئەوان زۆر بەو سات و سەودایە ئەڕێسن، بەڵام ئێمە کورتی ئەکەینەوە. بە کابرایان گوت بە چوار لیرە. ڕازی نەبی هیچیشت نادەینێ و پارەی بیرەکانیش کە خواردووتەتەوە گارسۆن بە تێهەڵدان لێت ئەسێنێ. ناچار ملی داهێنا وتی: «دە بمدەنێ چوار لیرە.» وتمان: «جارێ لە پێشەوە جێ و شوێن و نمرەی خانووی ئافرەتەکەمان پێ بڵێ پارەت ئامادەیە.»

لەو کاتەدا حسابم کرد چوار لیرە بدەم، نیو لیرەم پێ دەمێنێ. جارێ ئەوەم لێک نەدایەوە و وتم: «دەبیڵێ!» وتی:

- ناوی ئافرەتەکە میکایلا قورتستایە.

ئۆخەی وا ناویم بیست، لە خۆشیانا تەمام بوو هەڵسم ئەو دەمە پیسەی ماچ بکەم، فریدریک گرتمی.

- جا میکایلا ئێستە لە کوێیە؟

- وا لە ئیتالیا، شاری ناپۆلی.

- ناپۆلی دوورە یان نزیک.

- کە ڕۆین ئەزانی!

- ڕۆینی چی؟

- ئەگەر بە شەمەندەفەر بڕۆن نزیکە.

- شەمەندەفەر، عەرەبانەی پۆستە نییە؟

- نەخێر، ئەگەر بە عەرەبانەی پۆستە بڕۆن، دوو مانگ ڕێیە.

- شەمەندەفەر لە کوێ دەست دەکەوێ؟ لە بەر ئەم گازینۆیە ناوەستێ؟

- نەخێر، ئەبێ بچیتە ڕۆژئاوای ویانە، شەمەندەفەر لەوێ ڕائەوەستێ.

- بۆچی پیاوە تا ڕاوەستێ؟

- نەخێر، ئاسنە و بە ئاگر ئەڕوا، کە لێت نەخوڕی خۆی ڕائەوەستێ.

- باشە وا گەیشتینە ناپۆلی، لەوێ ماڵی میکایلا لە کوێ بدۆزینەوە؟

- ئەچیتە دائیرەی پۆلیس و ئەپرسی، لەوێ خەبەرت ئەدەنێ.

- خۆ دائیرەی پۆلیسی ئەوێ وەک پۆلیس بێگانەن و من ناناسن، ئەبێ لەوەوپێش دوو شەو بمانخەنە بەندیخانە، تا دەبین بە دۆست.

- بۆچی ئەتخەنە بەندیخانە، تۆ خاوەنی ئەم کوستومە بی، کەس شوبهەی منت لێ ناکات. بە تایبەت کە تۆ هەواڵی خێزانی قورستا بپرسی، هەموو کەس بەڕێزەوە تەماشات ئەکات، چونکوو خێزانێکی زۆر شەریف و ناودارن.

کە وای گوت جارێ لە پێشەوە نائومێدی و ماتییەک گرتمی، چونکوو کچێکی وا ناودار و خانەدان چۆن ئەبێ شوو بە من بکا! دوای ئەوە کە نەزاکەت و ویژدان و شەفەقەتی میکایلام لێکدایەوە، هێنامە پێشچام، هاتمە سەر ئەوەی ئەم کچە منی لە هەموو کەسێ زیاتر بووێ، چونکە من عەیبم تەنها هەژارییە و ئەویش پێویستی بە پارە نییە. یەتە بازاڕ خۆشەویستی کە لە بازاڕی هام سەریدا موحیببەت لە هەموو شتێ پێشترە! هەر من ئەزانم ئەوم خۆش بووێ و بە هەموو مەعنایەکەوە ئەیپەرستم. هەروەها لە هەموو کاتێکدا بێ قسوور ڕۆحی خۆمی لە ڕێدا ئەبەخشم، بەمە ئومێدم هاتەوە دڵ، کابرام ئیزن داو و پارەی بیرەکانم دا. کە لێکم دایەوە، پێنج مارکم پێ ماوە، جا چی بکەین! وتم: «فریدریک، حاڵەکەمان ئەمەیە!» وتی: «خوا کەریمە.»

بە پێیان ملی ڕێگەمان گرت و هاتینەوە ئوتێل، چووینە ژووری، بۆی هات و وتی: «چیتان ئەوێ؟» وتمان: «جارێ

هیچ، بە کاتب بڵێ حسابی مەسرەفی ئوتێلمان بۆ بێنێ.» ئەو ڕۆیی و کاتب هات، کاغەزێکی دووروودرێژی بە مارکەی ئوتێلەوە هێنا. وەخۆیەوە بەند نەبوو، ڕۆیی و کە تەماشام کرد، بێ ئیختیار ئایەکم کرد.

| مارک | |
|---|---|
| ١٦ | پارەی نوێن و نووستن |
| ٦ | خواردن |
| ٣ | بەخشش |
| ٢٥ | هەمووی |

فریدریک وتی:

- ئەمانە پیاو ئەڕوتێننەوە.

- ئێستا کە هەرچی قەوماوە گرنگ نییە، با چارەیەک لێک بدەینەوە.

- چی لێک بدەینەوە؟

- ئەوا سەعات نۆ و نیوی شەوی لێدا، تا سەعات دە با هیچمان قسە نەکەین و لە زهنی خۆمانا لێکی بدەینەوە. بەڵکوو چارەیەک بدۆزینەوە.

دوای نیو سەعات فریدریک سەری هەڵبڕی و وتی:

- ئەلفرێد وا شەو بووە نیوەشەو، هەموو کەس نووستووە، با ئێمە سووکێ بۆی دەرچین و خۆمان دەرباز کەین.

- هەی قورم دا بە دەمتا، بە نیو سەعات لێکدانەوە ئەمەت دۆزییەوە. نازانی ئوتێل بێ پاسەوان و نۆبەتچی نابێ. شەو قاپییەوانی هەیە، گریمان لێرە دەرباز بووین، کۆلان قۆلی دەوریەی هەیە، ناڵێن بۆچی بەم نیوەشەوە کەوتوونەتە کۆلان؟

- جا یەکێکمان نۆبەتچییەکە بە قسە ئەگرین تا ئەوی دیکەمان دەردەچێ، تا دێت بە شوێن یەکێکمانا ئەمی تریشمان ڕا ئەکا، ئەمە چاری ئێرەیە. چاری کۆلانیش تۆ بیدۆزەرەوە.

- ئەمە ناکرێ هەروا باشە، بەیانی ئەچینە دەرێ، ئەڵێین ئێستا دێینەوە و ناشیەینەوە.

- ئەی جا دوایی بماندەنە دەست پۆلیس و بڵێن ئەمانە کەڵەکچی و ئاین و ئۆنکەرن.

- کەوابێ بوەستە شتێکی تر هات بە خەیاڵما، بەیانی کە چووینە دەرەوە، ڕاست ئەچینە ئەو موغازەیەی جلەکانمان لێ کڕیبوو. جلە تازەکانیان ئەدەینێ و کۆنەکانی خۆمان لەبەر ئەکەینەوە.

- ئینجا موغازەچی چۆنی ئەوێنەوە؟

- هێشتا تەواو قەدی نەشکاوە، کە وتمان بە کەم لێمان بکڕەوە، دەستیشمان ماچ دەکەن.

- باشە وا جلە تازەکانمان دایەوە بەسەر خاوەنیانا، ئەی کۆنەکانمان لەو موغازەیەن؟

- دیسان شاگردەکە ئەنێرین بۆمان بگەڕێنێتەوە.

- بەڵکوو فرۆشتبێتی!

- ئەی هوو! تۆ زۆر قووڵ ئەیخوێنیتەوە، وا من خەوم دێ، جارێ با بنووین.

نووستین و بەیانی من زوو خەبەرم بووەوە، فریدریکم هەڵساند، خەواڵوو بوو. هەڵدەسایە سەر قنگ و خۆی نەدەگرت، چووم هەندێ ئاوی ساردم هێنا و دام بە دەموچاویا. گەشکە گرتی و لاڵ بوو. چاوی ئەبڵەق بوو.

ئینجا پەشیمان بوومەوە، ماوەیەک لە خۆم دا و ئەو هێجگاری تۆقی. هەموو بەدەنی کەوتە فرتەفرت، ناچار سواری شانی بووم و دامڕماند. هەندێکم کوتا، نەختێ ئارەقی کرد و پاش ماوەیەک چاوم هەڵبڕی و وتی: «ئەلفرێد، من چیم لێ بەسەر هات؟ لە خەوما ئەفڕیم.» وتم: «لە خەودا فڕین باشە.»

ئینجا هاتین و فانیلە و کراس و پێڵاوەکانمان لەبەر نەکرد، خستمانە بن باخەڵ و جلەکانمان بێ کراس و فانیلە لەبەر کرد. لە قاپی کاتبەکە کە ئێمەی وا دیت، پێکەنی. وتی: «بەم تەوالیتووە ئۆغر بێ.» فریدریک وتی: «خۆمان ئەچینە حەمام و ئەمانەیش ئەبەین بۆمان بشۆن.»

کاتب وتی: «خۆ ئوتێل حەمامی هەیە و دەتوانن بێ پارە خۆتان بشۆن، جل شۆریش هەیە بە هەرزان ئەیانشۆن.»

فریدریک وتی: «ئەوەتا ئەمجارە وامان کرد، جارێکی تر بەو جۆرە ئەکەین کە تۆ ئەڵێی.» سا ئەمەمان وت و فڕکەمان کردە کۆلان، کەسی لێ نەبوو و بە ڕاکردن چووینە بەر موغازەی

جلەکان، چوونە ژوورەوە و کابرا مشتەرییە گەورەکانیی ناسییەوە و هەستا.

- ئۆو فەرموون، بە ئەقڵ زۆر مەمنوون بوون وا هاتوون جلی تر بکڕن. ئا کوڕە شاگرد یەک دوو دەستە جلی پیاسە و ڕاو و سواری و بالو بێنە.

شاگردەکان کەوتنە خۆ فڕان، فڕان پەیتا پەیتا جلیان هێنا. لە بەردەممانا کۆمەڵەیان کرد، بە ڕاستی من تووڕە بووم وتم:

- ئەم هەرزەچەنەیە چییە ئەیکەن؟ ئێمە ئەڕۆین و تۆش جلمان بۆ دێنی؟

- ها ها ببوورە، ڕاست ئەفەرمووی، زۆرم قسە کرد و سەرم ئێشاندی. چی بکەین وەزیفە و مەسەلەکە وای ئەوێ، ئا کوڕە دەستێ جلی سیاحەتیان بۆ بهێنە.

ئینجا فریدریک تووڕە بوو و بە نیوەشەڕەوە وتی:

- کابرا تۆ ڕاوەستە، ئێمە دوو وشە بڵێین، تێبگە ئینجا ئەوەندە چەنە بدە.

- باشە ئێوە وتتان ئەڕۆین و منیش تۆم جلی سیاحەتیان بۆ بێنن.

- جلی چی؟ ڕاوەستە بزانم بۆچی هاتووین.

- ئەوا ڕاوەستام، بەڵام دیارە ئەوەی بێتە ئەم موغازەیە بۆ جل دێ.

- نەخێر، بۆ جل نەهاتووین.

- کەوابێ بۆ جانتای سیاحەت هاتوون؟

- نەخێر هیچ لەمانە نییە، جاریَ ئەوا سوێند ئەخۆم، تا من لە قسەی خۆم نەبمەوە، نقە بکەی دەمت ئەشکێنم

- خۆ دەمم نابەستن، کە تۆ دەمم بشکێنی لەم موغازەیە دەرم ئەکەن، کەوابێ منیش لە پێشەوە هەقی خۆمت لێ ئەسێنم.

هەرچی شاگرد و حەماڵ و ئێشکدار لە موغازەکەدا بوون کۆبوونەوە. ئینجا ناچار من چوومە پێشەوە و وتم: «باوکم لێی مەگرن، ئەمشەو فێی لێهاتووە. بەڵام من ئاوی ساردم بە سەریا نەکردووە، لێی مەکەن بە ئیقرار، هەر خۆی وای لێهاتووە.»

«بە سەری تۆ هەر ئێستا ئەیدەم بە پۆلیس، من شاهێدم تۆ برای خۆتت شێت کردووە. بەخێری خۆم جاریَ براکەت چاک ئەکەمەوە، ئەوەی فێی لێ بێ ددانی هەڵدەکێشن، ئیتر چاک ئەبێ. ئا *فەردیناند*، بچۆ وەستای دانساز بانگ بکە.»

تێفکریم تا دێت لێ ئەبێتەوە، وتم: «برا، خوا هەڵناگریَ ئێمە غەریبین، ئەمەمان پێ ڕەوا مەبینن.»

- ها وەرە سەر ڕێ، جا بزانم چیت ئەوێ.

- بە کورتی و ڕاستی ئێمە بۆ سەفەر ئەم جلانەت پێ ئەفرۆشینەوە.

جاریَ پیا هات و وتی: «چەورتان کردووە وا لەکە و چکی گرتووە. ئێمە جلی کۆن ناکڕین.» بە هەزار حاڵ گوایە بۆ خۆی لەبەریان ئەکات، بە پێنج لیرە و نیو لێی کڕین، شاگردەکەشی نارد کۆنەکانیان بە دوو قیمەت بۆ هێنایەوە و

لەبەرمان کردن. بە بەردەمی ژووری کاتبەکەدا ڕابووردین و بانگی کرد: «سەرسواڵکەرینە، ئوتێل جێی سواڵ نییە.» وتمان: «برا ئێمە خۆمان لە ئوتێل بووین، پارەی ئوتێلمان بە سەرەوەیە و ئەیدەین. وتی:

– ئەتانەوێ حەیای ئوتێلەکەمان بەرن، وابزانم ئێوە بەکرێگیراون، تا دوایی لە پێش چاوی خەڵک بڵێن ئێمە لەو ئوتێلە بووین، بۆ ئەوەی دوژمن پێمان بڵێ ئوتێلەکەمان جێی دۆم و قەرەج و سەرسەری و گیرفانبڕە.

لە قینا تەمام بوو بڕۆم و پارەکەی نەدەمێ. فریدریک وتی: «توخوا ئەلفرێد با حەقی کەس نەخۆین، ڕێمان لە بەرە و تووشی تەگەرە ئەبین.» ئینجا چوومە پێشەوە، دەستێکم نا بە پێڵووی خوارووی چاوما، چاوم لێ زەق کردەوە و وتم: «کوڕە منم ئەلفرێد ئەفەندی.» کە ئیعلانەکەم نووسی، ئینجا بە دەنگما ناسیمییەوە. قەدەرێ پێکەنی و وتی: «خۆ کەرنەواڵ نییە، بۆچی وا خۆتان کردووە بە مەخسەرە و (لاتەرنە) لێ ئەدەن.» وتم: «لە باتی لاتەرنە کەمان لێ ئەدەم، بڵێ کەمانەکەم بۆ بێننە خوارێ، ئەمەش پارەکەت.»

پارەکەم دایێ و وتی: «باوەڕتان بێ مادام ئێوە ئەوەندە دڵساف و سەرڕاستن، هەمیشە خوا چاکتان بۆ ئەکا، بڕۆن خوا ئاگادارتان بێ.»

## فەسڵی دووەم

ئەوا ئەمانەوێ شەمەندەفەر بدۆزینەوە و لە ویانە دەربچین. لە پیاوێکمان پرسی: «برادەر، ئەستاسیۆنی شەمەندەفەر لە کوێوەیە؟» جارێ کابرا ورد ورد تێمان فکری، جا وتی: «شەمەندەفەر چی لێ ئەکەن؟؟» وتمان:

- سواری شەمەندەفەر ئەبین.

- بۆ کوێ ئەچن؟

- بەسەر پێوە تا ناپۆلی.

- جا خۆ شەمەندەفەر تا ناپۆلی ناچێ.

- ئەی تا کوێ ئەچێ؟

- تا نیوەی ڕێ، لەوێوە سواری ئەقتارمە ئەبن.

- ئەی ئەقتارمە چییە؟

- ئەقتارمە ئەوەیە کە ئەم شەمەندەفەرە تا سنووری نەمسا ئەچێ، لەوێ دائەبەزن و ئەچنە سنووری ئیتالیا و سواری شەمەندەفەرێکی تر ئەبن.

- سا قوربان کەواتە بە خێری خۆت ڕێگەکەمان نیشان بدە.

جادەیەک بەو بەرمانەوە بوو، وتی: «ئەم جادەیە بگرن و ملی ڕێ بەر مەدەن.» لە ڕاستیدا ئەو ڕێیەمان بەر نەدە و

گەیشتینە بینایەکی گەورە، وتیان ئەمە ئەستاسیۆنە. سالۆنێکی زۆر گەورە بوو.

فریدریک وتی: «ئەلفرێد، ئەبێت شەمەندەفەرەکە بێتە ئەم سالۆنە و لێرەوە بڕوا.» وتم: «ڕاست ئەکەیت، با دابنیشین تا دێ.» تەماشامان کرد زۆر کەس وەک ئێمە دانیشتووە، تەنانەت لادێیش هاتبوون تا سواری شەمەندەفەر بن. ئێمە هەر دانیشتین، شەمەندەفەرەکە نەهاتە سالۆنەکە، وەک قیامەت هەڵسابێ ئەم هەموو خەڵکە بە بەردەمماندا لەم قاپییەوە ئەهاتە ژووری. کونێک لە دیوارەکەدا بوو، سەریان ئەنایە ئەو کونە و پارچەیەک نانی تیریان وەر ئەگرت. لە قاپییەکەوە ئەڕۆیشتین، ژنێک بە پەلەپەل بە لاماندا ڕابورد و تەماشای ئێمەی کرد، پێکەنی و دەستەسڕێکی لێکەوت. هەڵم گرت و بردم دامەوە دەستی، سوپاسی کردم و لێم پرسی: «خانم، ئێمە هاتووین سواری شەمەندەفەر بین، هێشتا شەمەندەفەر نەهاتووە.» وتی:

- شەمەندەفەر بێتە کوێ؟

- ئەی نایەتە ئەم سالۆنە؟

چۆن دێتە ئێرە! ئێوەش لەو قاپییەی ئەوبەرەوە بەو قادرمە مەڕمەڕانەدا بچنە خوارێ. شەمەندەفەر لەوێ ڕائەوەستێ. هاتمەوە وتم: «نامەرد فریدریک، هەڵسە با ڕاکەین، شەمەندەفەر لە دەرەوەیە.» هەڵسا و بە ڕاکردن بە قادرمەکاندا چووینە خوارێ. بینیمان بیست سی ژووری ئاسن و تەختە بەیەکەوە بەستراو لەسەر ڕەوڕەوەیەکی ئاسن حازر و ئامادە وەستاون و خەڵک سوار ئەبن. ژوورێکی جوانم هەڵبژارد و چووین سوار بین، قاپیمان کردەوە و دە کەسی

تیـــابوو، یەکێکیـــان لێمـــان تـــوورە بـــوو و وتـــی: «لە شەمەندەفەریشـدا هەر ناڕەحەتمـان ئەکەن. هـا ئەوە مارکێـک بڕۆن و دەرگاکە داخەن.»

- ئەفەندی، ئێمە سوالّکەر نین، بەڵکوو ئەفەندییەکین وەک تۆ و ئێمەش سوار شەمەندەفەر ئەبین

- ئەمە جێی ئێوە نییە، بگەڕێن جێی خۆتان بدۆزنەوە.

لە قینا توند دەرگام پێوەدا و شـەقەم لێوە هەستاند. هـاتین ژوورێکی جوانترمـان دۆزییەوە، دۆشـەکی سـەر کورسییەکان هەمـوو قەیـفە بـوون و خۆمـان هەڵـدا بچینـە ژووری یەکێـک چاکەتێکی ڕەشی دوگمەزەردی لە بەردا بوو، ئەبریسکایەوە و لێمـــان تـــوورە بـــوو: «کـــابراینە، ئەوە چـــی دەکەن، وەرنە ئەملاوە.» من وتم: «سواری شەمەندەفەر ئەبین.» وتی:

- بلیتتان کوا؟

- بلیت چییە؟

- ئەی بە هەوا سوار ئەبن؟

- من سواری عەرەبانەی پۆستە بووم، کە دابەزیم پارەکەم دا. ئێستاش کە دابەزین پارەت ئەدەمێ مەترسە، نیوەی پارەی جلەکانمم پێ ماوە.

پێکەنـی و وتـی: «وا نـابێ، تـا زووە بچـن بلیـت وەرگـرن، ئەگینـا فریـا نـاکەون و شـــەمەندەفەر ئەڕوا.» شـوێنی بلیتـی نیشـان دایـن و ڕامـان کـرد. کـونێ بـوو، لە پەلەپەلیـدا لـێکم نەدایەوە کە تەواو سـەرمی پیـا دەچـێ یـان نـا، سـەرم خـوار

کـــردەوە و بە هەزار حـــاڵ ســـەرم بـــردە ژووریٚ، کەچـــی کابرایەکی مۆن هات و زلەیەکی لێدام.

هـاتم ســەرم بکێشـمە دواوە، پشـتتی ملـم بەر شووشـەکە کەوت و برینـــدار بـــوو. سەریشـــم نەهـــاتە دەریٚ و بـــانگی فریدریکم کرد، بە هەزار حاڵ سەرم ڕزگاری بوو. دەستم کرد بە جنێودان بە کابرا، کە زانی خوێن لە سەرم هاتووە دەنگی نەکرد و وتی:

- تۆ چیت ئەویٚ؟

- بلیت، ئەمەویٚ سواری شەمەندەفەر بم.

- بۆ کویٚ ئەچی؟

- بۆ ئیتالیا.

- پارە بدە زوو کە!

لیرەیەکم دایێ و وتـم دوو کەسین، دوو بلیتمـان بدەریٚ بۆ ئیتالیا. کـابرا پێکەنـی و وتـی: «بـۆ نـاپۆلی دوو کەس بە ١٩٢ مـــارکە.» وتـــم: «زۆرە ئەفەنـــدی، نەختـــیٚ وەرە خـــوارەوە.» تێفکریم دەرکی کۆنەکەی داخست و ڕۆیی وتی: «تۆ تا دوو سەعاتی تر، چاوەڕوانی تەنزیلات بکە.»

دوو ســەعاتی بە ســەرا ڕابــوورد و ئــێمە هەروا لەو دالانە دانیشـــتبووین. ڕوانیمـــان لەمـــلا و لەولاوە خەڵـک هـــاتنە بەر کۆنەکە. وتی: «لە ڕاستیدا وەختی بلیت هاتووە.» فریدریکیشم لەگەڵ خۆم برد و چووینە بەر کۆنەکە، ئەمجارە نەموێرا سەر بکەم بە کونا، دەمم نا بە کونەکەوە و تا خوا هێزی دابوومیٚ

بـانگم کـرد: «هـۆ کـابرای زلەوەشـێن، لە کـوێی!» بلیتچـی تەماشای کردین و وتی:

- دیسان شوانە قەحبەبابەکانن، چیتان ئەوێ؟

- مسیۆ تکا ئەکەم، ئێمە ئەوەندە پارەمـان نییە، نەختێک بۆمان کەم بکەرەوە.

- برا خۆ ئەمە ماڵی باوکم نییە بیبەخشم، بە ژمارە بلیتیان داوەتێ و پارەم لێ وەرئەگرنەوە.

ئینجا فریدریک پاڕایەوە، تێفکریم لە ژوورەوە دەنگێکی گڕ و قەبە بانگی کرد: «ئەوانە کێن؟ مۆریس تۆ بۆچی ئەمەندە قسـە ئەکەی، لەبەر چەنەبـازی نـاتپەرژێە سـەر فەرمانەکانت، ئەوانە کێن وا گەمارۆیـان داوین، دەی دەریـان کە.» سـا لە پێشـەوە ئەم نەزاکەت و ئیکـرامە، لە دواوە یەکێـک یەخەی چـاکەتەکەی گـرتم و ڕایکێشـامە دواوە. وا تێمـنەوی بە پشـتا کەوتـم، کە هەستامەوە بەری چاوم تاریک بوو و لە داخانا وەرگەڕامەوە و زللەیەکم پیاکێشا. ئەویش زللەیەکی لە من دا و فریـدریک لە دواوە بەربـووە وێـزەی و شـل شـل کوتـای. کـابرا هـاواری پۆلیسـی کـرد و ئێمە ڕامـان کـرد، دیـاربوو ئەو پەلەپەلـی بـوو بلیتـێ وەرگـرێ. بە ڕاکـردن چـووە سـەر قادرمەکـان و خـۆی گەیانـدە شـەمەندەفەر، بەڵام تـا ئەم گێرەوکێشـەیەیان بە سـەرا هات، کونەکە چۆڵ بـوو و چـوومەوە لای بلیتفرۆش. بـۆم کـرد بە چل مارک سوودی نەبوو، دەتگـوت مـارەیی دایکییەتـی و لە سەدونەوەد پوول کەمتری نەدەکردەوە، تووڕەیش بوو و وتی:

- نرخەکەی لەسەر نووسراوە.

- جا بە دەستی خۆتە، چەندی لێ بنووسی ئەبێ.

- چاپ کراوە.

- مەکینەکە وا لە بەردەمتا، دوو تەقەی لێ مەهینە و با تەقەیەک بێ و پارەکەی کەم بێ.

- لاحەولەوەلا تووشی چی هاتم، ئینجا ئاخر سوورە.

- بابە ئەوە پەنجا مارکەکەم، بەم پارەیە تا کوێمان ئەبەی بلیتی ئەویمان بدەرێ.

- خۆ ئینشاڵلا سواری کۆڵی من نابن، شەمەندەفەر ئەتانبا. کەوابێ تا فلاکفۆرد ئەڕۆن، لەوێ دائەبەزن ئیتر لەولاوە چی ئەکەن؟

- لەولاوە بە پێ ئەڕۆین، ئەگەر ڕێمان بزانیایە، ئەم هەموو شتانەی خۆمان لە دڵ ڕەقێکی وەک تۆ خەسار نەئەکرد.

دەستی برد و دوو مەقەبای چوارگۆشەی دەرهێنا، دایە بەر مەکینە و تەقەی لێ هەستاند. جا چاکی کرد و دایە دەستمان، ئینجا لێم پرسی:

- ئەو شوێنەی کە لێی دادەبەزین، بۆ ناپۆلی زۆری ئەمێنێ یا کەم؟

- لە پیادەڕۆیندا خێران یا سووکەپێ ئەڕۆن؟

- مەترسە من چاک ڕادەکەم، تەنانەت لە دێیەک ژنێکیان بە زۆر لێ مارە کردم و لە تاوا ڕامکرد. هەموو گەنجەکان تۆزی پێیان نەشکاندم.

بەم زەدوخـــــوردە بلیتمـــــان وەرگـــرت و شـــــوێنی شەمەندەفەرەکەمان ئەزانی. چووینە خوارێ و تەماشامان کرد شـەمەندەفەر وەسـتاوە، بەڵام وەک شـەمەندەفەرەکەی بەیـانی نیـیە. فریـدریک وتـی: «ئەلفریـد، کاشـکا بەیـانی ئەوەنـدە گیروگرفتـت دروسـت نەکـردایە و ئەوسـایە سـواری ئەو شەمەندەفەرە جوانانە ئەبووین. ئێسـتا ئەمـانە دەرگایان نییە و سـەریان والایە، ئەگەر بـاران ببـارێ ئەبـین بە جلەسـەگ.» ڕاستی ئەکرد، بەهەرحاڵ چووین دەرگای یەکێکیمان کێشایەوە و چووینە ژوورەوە. ڕوانیمـان چوار دیوارێکی پان و درێژی ئاسنە. وەک چـووین سا ئێمە سـوار بـووین و دوو زەلام بە ڕاکردن هاتن بانگیان کردین:

- کوڕە ئەوە چی دەکەن لەوێ؟

- ئێمە سواری شەمەندەفەر بووین، پارەمـان پێشـەکی داوە. نیشـان بەو نیشـانەی یەکـی مقەبـایەکی چوارگۆشـەمان پێـیە، کـابرا تەقەی لێهەڵسـاندووە، وا بە سـەریا تڕیـوە، هەردوو سەری چاک کردووە.

یەکێکیان پێکەنی و ئەوی تریان وتی:

- ڕاستی ئەمە جێی ئێوە نییە، بەڵام ڕاست بۆ ئێوە دانراوە، ئەمە جێی گاگەلە، خۆ ئیوەش دیارە گان.

هـات بە دڵمـا کە ئایـا گـاجووت هەرزانتـر سـوار ئەکەن یـان زەلام. پاشـان لـێکم دایەوە کە ئەوان قورسـترن، ڕەنـگە لەوان زیـاتر پـارە بسـتێنن، ئەم مەراقەم لە دڵـی خۆمـا نەهێشـتەوە و پرسیم:

- هۆ کابرای پیشەکیی تووڕە، تووخوا پێم بڵێ نرخی گاجووت چەندە؟

کابرا پێکەنی و وتی:

- هەر گای دە مارکە.

ئینجا من پێکەنیم و وتم:

- ئافەریم بۆ ئەقڵتان، گاجووتێک هێندەی سێ زەلام ئەبێ بە دە مارکە، کەچی ئێمە بیست مارک و باریشمان هیچ نییە. وەک لە پێشدا ئێمەتان بە گاجووت دانا، پارەیشمان هێندەی گاجووت لێ بسێنن.

- باشە، بەڵام ئێوە لە فارگۆنی سەرگیراو و قەنەفەی قوماش پیادادراودا دانیشن. ئەوە زووتر ئەڕوات.

لەم گفتوگۆیەدا بووین لە ئەساسیۆنەکەوە کابرایەکی کەتەی ئەستوور، هات بە شەمەندەفەرچییەکەی وت:

- تا کوێیان ئەبەن؟

کابرا بەسەکە هێندێ لەگەڵ شەمەندەفەرچییەکەدا دوا و ڕووی کردە ئێمە و وتی:

- چەنتان داوە؟

- پەنجا مارک.

- ئەتانەوێ پارەکەتان بستێننەوە و خۆشتان سوار بن؟

- بەڵێ.

- وا من لێرەم، دوو فارگۆن گاجووت ئەنێرم، پارەکەیشتان ئەدەمەوە و لەگەڵیان سوار بن.

ئێمە سەرکەوتین و گاجووتیان هێنا، یەکە بە یەکە سەریان خستن. دە گاجووتیان خستە تایەکە و بە منیان وت: «تۆ لای ئەمانە بە، هاوڕێکەشت لەولاتر، لای ئەوانی ترە.» من وتم: «نەخێر، لێک جیا نابینەوە، هەر دەبێ بەیەکەوە بین.» کابرا وتی: «باشە با بەیەکەوە بن، بەڵام جار جار بچن و سەریان لێ بدەن، بیاندۆشن و شیرەکانیان بکەن بە پەنیر.» وتم: «خۆ گونیان هەیە!» وتی: «نێرە، بیدۆشە.» لەپڕ تێفکریم فیکەیەکی توندوتیژ و خرتەخرتێک لەژێرمانەوە پەیدا بوو. توومەز شەمەندەفەرەکەیە کەوتۆتە جووڵان. فریدریک وتی: «ئەلفرێد، ئەو دوو ولاخانەی کە ئەم عەرەبانەیە ئەبەن بە ڕێوە لە کوێن؟» وتم: «لەژێرەوەن، ئەمانە بە سەرپشتی ئەوانەوەن.» سا لەم گفتوگۆیەدا بووین، دنیا بە جارێک تاریک بوو، وتم: «فریدیک، بۆچی وا تاریکە؟» وتی: «لە ئەستاسیۆن دوورکەوتینەوە، چرا لە ڕێدا نییە و ئەم فارگۆنەش گاجووتی تیایە، چرا بۆ گا ناسووتێنن.» وتم:

- بۆچی ئێمە ئینسان نین؟

جارێ تۆ خۆت بە گاجووت دایە قەڵەم و بە بلیتی گاجووت لە فارگۆنی گاجووتای. ئیتر چی!

هەروا بە تاریکیی چاوم ڕێشکەوپێشکەی ئەکرد، ترسم لێ نیشت و وتم ئێستە ئەم گاجووتانە بە قۆچ دێنە وێزەم و چاوم کوێر ئەکەن.

مـن لەو ترسـەدا ئـۆقرەم لێهەڵگیرابـوو، فریـدریک چـونکە شـوانی کردبوو، نەدەترسـا. گۆرانییەکی دەسـت پێکـرد و لێـی تووڕە بووم و وتم:

- من ئەمە حاڵمە، تۆش گۆرانی ئەڵێی؟

- خۆ ئینشاڵڵا ناگریم! بە بێ پارە سواربووین و لەگەڵ ئەم یۆڵداشـانەش کە لەپـێش تـۆدا ناسـیومن، یەک کەوتینـەوە. مـن گۆرانیان بۆ دەڵێم و تۆش لەبەر خاتری من کەمانیان بۆ لێدا.

پێستی سەرم ئاوسا، وتم:

- خوار بتگرێ بۆنم پێوە دەکەن، هاکا سوارم بوون.

فریدریک پێکەنی و وتی:

- بەخوا ئەمانە لە پیاوی سپڵە باشترن، بێزیانن.

- ئەم فەلسەفەیەت هەڵگرە بۆ شوێنێکی تر، ئێستا چارەمـان چییە؟

- من چارە نازانم.

- با لێرە خۆمان فڕێ بدەینە خوارێ و بە پێیان بڕۆین..

- ملمان ئەشکێ.

- لە جێیەکی نزم باز دەدەین.

- جێی نزم کوا؟!

خـوا و ڕاسـتان لەو دەمەدا شـەمەندەفەر لە بەرەوژێـرییەک کەوتە لەنگە و هێواش ئەڕۆیشـتین. زۆرم لە فریـدریک کـرد و خۆمـان فڕێدایە خـوارێ. ئەو هـاواری کـرد: «بـاوکەڕۆ پشـکم

شکا!» منیش بانگم کرد: «سێبەندەم وەرگەڕا.» ماوەیەک لەسەر گازی پشت کەوتین، کە هەڵسایین، دنیا تاریک و نووتەک بوو.

- جا چی بکەین؟

- چووزانم.

- با ڕاوەستین تا شەمەندەفەری پیاو دێت و سوار ئەبین.

- ئەوا گریمان شەمەندەفەر هات، چۆن لێرە ڕائەوەستێ؟

- حەی، کە بلیتەکەم هەڵبڕی و نیشانم دا، ناچار ڕائەوەستێ.

- باشە کە تۆ پەنجا مارکت داوە، ئیتر وا دەزانی هەموو شەمەندەفەری دونیا لەژێر ئەمری تۆدایە؟ جارێ با ئاوەدانییەک بدۆزینەوە و پەنچکێ نانمان دەست کەوێ، ئینجا سواری شەمەندەفەر ئەبین.

- ئێمە گەر بە شوێن ئاواییدا بگەڕێین، جارێکی تر ئەم هێڵە نادۆزینەوە.

- ئەی چی بکەین، هەر لێرەش دانیشین لە برسا ئەمرین. من تەگبیرێکی ترم دۆزیوەتەوە، با ئەو ڕێیە نیشانە بکەین کە پیایا ئەڕۆین.

- چۆن نیشانەی بکەین؟

- چۆنی نیشانە بکەین! بەرد ئەچنینەوە و هەر سێ هەنگاوێک بەردێ دائەنێین، کە گەڕاینەوە گوم نابێ.

هـاتین گیرفـان و شـەبقەمان پـڕ کـرد لە بەرد و هەر سـێ هەنگاوێـک بەردێکمـان دانـا. سـەعاتێ بە ڕێدا ڕۆیـین و بەرد بڕایەوە و گەیشـتینە جـادەیەک بەردمـان دەسـت نەکەوت. جـا چـی بکەیـن! فریـدریک وتـی: «بـا ڕوو بکەیـنە خـوا.» نەختـێ پـاڕاینەوە و ڕووەو قـدووس دانیشـتین. فریـدریک لە مەقـامی مناجاتی کڵێسە بە دەنگێکی سۆزناکەوە دەستی پێکرد. هـاتمە جـۆش و کـوڵی گریـانم نەدەنیشـتەوە. لە ناکـاو دەنگـی سەگوەڕێک پەیدا بوو. هەردووکمان ڕاپەڕین و ڕوومان کردە دەنگی سـەگوەڕەکە. زۆر نەڕۆیشـتین، لە ملێک سـەرکەوتین و ڕوونـاکی دێـیەک دەرکەوت، هەر ئەوەنـدەی خـۆش بـوو تـا گەیینە دێ. سەگگەل گەمارۆی داین و فریـدریک هـاواری کـرد: «ئای ئەلفرێد، بمگرە من زۆر لە سەگ ئەترسم.»

- گوڕت بێ، لەو گاجووتە زلانە نەترسای لەم سەگە وردانە دەترسی؟

- من بە منداڵی سـەگ گەستوومی، زۆری لێ دەترسم.

هـاوارم کـردە دێ. خۆمـان کوتـابووە دەرگـای خـانوویەک و سـەگگەل لە پێشـەوە پەلامـاری داین. ئێمە لە ترسـا خۆمـان لە قاپییەکە توند ئەکرد و لەپڕ قاپی ترازا و هەردووکمان بە پشـتا کەوتینە ئەودیو دەرگاکەوە. پیاوێک بە هەڵەداوان هـات و تێـی خوڕین:

- کوڕە کێن؟

- غەریبـین بـراکەم، ڕێمـان کەوتە ئەم دێـیە و سـەگگەل گەمارۆی داین. لە تاوا خۆمان کوتاوەتە ئێرە.

ماوەیەک تەماشای کردین و وتی: «ئێوە بە پیاو خراپ نازانم، فەرمووون.» دەرگای کۆڵانی داخست و پێشمان کەوت و بردینییە قاتی سەرەوە. قاتی سەرەوە زینهار، وا مەزانن قاتی دووەمی شاتووەکەی میکایلا بوو. دوو سێ پلیکانە سەرکەوتین، دالانێکی تەسک بوو. لە دالان تێپەڕین و لە دەرگایەکی دا و بانگی کرد: «لیزا، لیزا، هەڵسە میوانمان هات.» ئێمەی بردە هۆدەیەکی تر، قەنەفەیەکی حەسیر و دۆلابێکی تەختە و باقەیەک کتێبی لەسەریەک هەڵچنراوی لێبوو، لەگەڵ گۆزەیەکی کۆنی قۆڵشکاو و گلێنە و چرایەکی نەوت. لەبەر چراکە تەماشای گوێلاکی خاوەنماڵەکەم کرد. نە کورت، نە درێژ، پەڕە ملئەستوور، وەک دەروێشی پرچی بەرداوەتەوە و قەلەندەرێکی دەمبەپێکەنینە. پانتۆڵێکی ڕەشی لەپێدا بوو و جبەیەکی درێژیش لە بەردا، هەڵدەسووڕێ و خزمەت ئەکات.

ئێمەی لەسەر قەنەفەکە دانا و وتی:

- دیارە زۆر برسیتانە، هەر ئێستا نانتان بۆ دێنین.

ئێمەش پێشەکی سوپاسمان کرد، بەڵام من جاری لە پێشەوە لێم بوو بە مەراق کە ئایا ئەم پیاوەی دەیەوێ میوانداریی بکا کێیە؟ وتم:

- شوورەیی نەبێ، جەنابتان کێن؟

- من ڕاهبی ئەم دێیەم.

- منیش وا تێگەیبووم.

- بە چیا زانیت؟

- پرچت درێژە و سکت زلە.

- برادەر، کەوابێ لە زیرەکیدا بەشی کەست نەهێشتۆتەوە.

- تۆیش زیرەکیت کە زانیت لە ئاقڵیدا بەشی هاوڕێکەمم نەداوە.

زۆری پێ نەچوو دەرگا کرایەوە و ئافرەتێکی کەڵەگەتی چل چلوپێنج ساڵان دەرکەوت، مانتۆیەکی درێژی لە بەردایە و هێشتا چاوی ئەگلۆفی. هاتە ژوورەوە و وتی:

- حەی، ئەمانە کێن؟

ڕاهیب وتی:

- ڕێبوارن، ئەمشەو ڕێیان کەوتۆتە ئەم دێیە، سەگگەل گەمارۆی دابوون و خۆیان کوتاوەتە ئێرە. زۆریان برسییە. زوو پاروە نانێکیان بۆ چارە بکە.

شێخژن ئازایانە ڕۆیی و ئینجا ڕاهیب ڕووی کردە ئێمە و پرسی:

- بۆ کوێ ئەچن؟

- بۆ ناپۆلی.

- ناپۆلی کوێیە؟

- لە ئیتالیایە.

- ناپۆلی لە کوێ و ئێرە لە کوێ! زۆر لە یەکەوە دوورن.

هەرچیمان بەسەر هاتبوو بۆم گێڕایەوە. وتم لە شەمەندەفەر خۆمان فڕێدایە خوارێ. ڕاهیب حەپەسا و وتی:

- ئێوە لە شەمەندەفەر خۆتان فڕێداوەتە خوارەوە! چۆن ماون و نەمردوون؟

- وا ئەبینی ماوین. ڕۆحمان نەچووە بە بەر کەسا، وا هاتووینەتە ماڵی ئێوەش و ماڵەکەتان زۆر وێرانە. ئێمە ڕاهیبێکمان هەبوو ماڵێکی خۆش و پاک و تەمیزی هەبوو. تۆ دیارە ژنەکەت تەمەڵە و ماڵەکەت پیس و پۆخڵە.

- تا جارێ نانەکەتان ئەداتێ، پیرەژنمان لێ توورە مەکەن.

لەم قسانەدا بووین ژنە هاتە ژوورەوە و سینییەکی بەدەستەوە بوو. داینا و وتی:

- فەرموون.

- خولّقی پێ ناوێ.

فریدریک پەلاماری نانی دا و نانێکی هەڵگرت. تێی بەر بوو و نەیپرژایە سەر ئەوەی بڕوانێ سینییەکە چی تری لەسەرە، جارێ چاوی تەنها نانەکەی بینیبوو. کەچی پەنیر و باسورمە و هەشت نۆ هێلکەی کولاویشی لەسەر بوو. ئێمە شێتانە نانمان ئەخوارد و ئافرەتە پێمان پێنەکەنی. لێبووینەوە و هەڵسباینە سەر پێ، ڕاهیب وتی:

- ئۆغر بێت.

- ڕێبوار کە ڕێی لە بەر بوو، چاری ڕۆیینە.

- بەم نیوەشەوە چۆن ئەهێڵم بڕۆن.

- ماڵتان ئاوابێ، نارەحەتمان کردن، ئیتر بەسە.

- نەخێر ئێمە نارەحەت نابین.

لەو کاتەدا ژنەڕاهیبەکە هاتە ژوورەوە و وتی:

- ئەوە میوانەکانمان خەریکی چین؟

ڕاهیب وتی:

- خەریکن دەڕۆن.

- بۆچی تۆ ئەهێڵی بەم نیوەشەوە بڕۆن، هەر سەگ ئەیانخوا.

- من زۆرم پێ وتن.

- تۆ نازانی خولْقی میوان بکەی، ئەگەر ئەتەوێ نەڕۆن، سێ بە سێ تەڵاق بخۆ و بڵێ نابێ بڕۆن.

کە ئەمەمان زانی، ناچار ماینەوە و حەزیشمان ئەکرد. ڕاهیبەژن چوو و دوو دەست نوێنی بۆ هێناین. جێی بۆ داخستین و وتی: «ئینجا ئیتر بنوون، خەوی خێرتان بێ.» ئەوان ڕۆیین و بە فریدریکم وت: «برادەر، ئاگات لێیە ئەم ماڵە چەند چاکن. با بەخشیشێکیان بدەینێ.» وتی: «های های، زۆر چاکە.»

بە هەردووکمان حسابمان کرد دوو مارک و دە فنیک ببوو. بە خواردن و نووستن و هەموو شتێکەوە جویم کردەوە و نامە ژێر سەرم تا بەیانی لە بیرم نەچێ. بەیانی هەستاین و هاتم نوێنەکان هەڵگرم، لێفە و دۆشەکم هەڵگرت و مێزێکی شڕی کۆنیش کە ڕاهیب کتێبی خستبووە سەر، نوێنەکەم نایە سەری و مێز بە لادا هات. کتێب پەرش و بڵاو بووەوە و مێزەکە کەوت بەسەر گۆزەدا و گۆزەکە شکا و ئاو ڕژا. ژوور بووە مەرەزە، بە گرمەی نوێن ڕووخا و هاتن هیچ دەنگێکیان

نەکرد، لە خەجاڵەتیدا هەوڵم دەدا زوو دەرباز بین، بە بێدەنگی پارەکەم کردە دەستی ڕاهیبەوە و وتم:

- بە دووعا، ماڵئاوا.

ڕاهیب توند دەستی گرتم و وتی:

- ئەوە چییە؟

- خۆ سێبەری بن ئەشکەوت نییە، ئەوە هەقی خواردن و نووستنە و هێشتاش هەقی گۆزە و تەڕی ماوە.

- ڕۆڵە هۆشت بێ، ڕاهیب قەت پارە وەرناگرێ.

- حەی، ڕاهیبەکەی ئێمە لە مردووشی ئەسەند چ جای زیندوو. بۆیە دەوڵەمەند بوو.

- ڕۆڵە ئەوە ڕاهیب نییە.

ئینجا بە پەلەپەل هاتینە دەرێ و لەوێ دەرچووین. ڕۆژ بوو، سەگمان پێ نەوەڕی. وتم: «فریدریک، ئەم ڕاهیبە پارەی لێ وەرنەگرتین، کە میکایلام هێنا و دەوڵەمەند بووم، وا چاکە پارەی بۆ بنێرم.» وتی:

- زۆر باشە.

- کە تۆ بە کارێکی چاکی ئەزانی، با بگەڕێینەوە و خەبەری بدەمێ کە دەوڵەمەند بووم پارەی بۆ ئەنێرم.

- چۆن ڕووت دێ بچیتەوە، تۆ ئەو کەتنەشت گێڕا، با بڕۆین.

- له هه‌مووی خراپتر لێمان نه‌پرسی شه‌مه‌نده‌فه‌ر له کوێوه‌یه‌، ئێستا ڕوو بکه‌ینه کوێ؟

ڕوانیمان دوو که‌س باخ ئه‌کێڵن، بانگم کردن: «براگه‌ل، ئه‌ساسیۆنی شه‌مه‌نده‌فه‌ر له کوێوه‌یه‌؟» وتیان: «به ده‌سته ڕاستا ڕاست بڕۆن شه‌قامه‌. نیو سه‌عات به شه‌قامه‌که‌دا بڕۆن، دێیه‌کتان دێته پێش ئه‌ساسیۆنی شه‌مه‌نده‌فه‌ری لێیه‌.» زۆر مه‌منوون بووم. گیرفانی به‌رۆکم گه‌ڕام بلیتی شه‌مه‌نده‌فه‌ره‌که‌ی تیابوو، له خۆشیانا به هه‌ڵپه‌ڕکێ ڕۆیین. بیست ده‌قیقه‌ی نه‌خایاند گه‌یشتینه دێ. چووینه ئه‌ساسیۆنێکی خنجیله و له دالانه‌که‌یان شه‌مه‌نده‌فه‌چییه‌کمان بینی، لێمان پرسی:

- شه‌مه‌نده‌فه‌ر که‌ی دێت؟

- بۆ کوێ ده‌چن؟

- بۆ ئیتالیا.

- ئه‌بێ له ڕێگا ئیقتارمه بن..

- ئاخ، دیسان ئیقتارمه‌.

- هۆو، شه‌مه‌نده‌فه‌ر هات.

خۆی ڕۆیی و شه‌مه‌نده‌فه‌ر هات، ڕاوه‌ستاین تا خه‌ڵک دابه‌زین. ئێمه‌ش هه‌ڵمان کوتایه پێشه‌وه و قاپییه‌کمان هاته پێش، ته‌مامان بوو سواربین، له ژووره‌وه ده‌رگایان لێ پێوه‌داین. چووینه کۆمپانیایه‌کی تر و سه‌رکه‌وتین، کابرایه‌ک لێمان ڕاست بووه‌وه‌، زلله‌یه‌کی له فریدریک دا، ئه‌ویش زلله‌یه‌کی لێ دایه‌وه و منیش ڕاست بوومه‌وه و به

هەردووکمان زۆر چاک لێمان دا. شریتێک بە ژوورر سەریەوە بوو ڕای وەشاند و دەنگی ڕیل پەیدا بوو. شەمەندەفەرچی هات و پرسی: «ئێوە کێن و بۆ کوێ ئەچن.» وتم بۆ ئیتالیا ئەچین، داوای بلیتی کرد و وتم بلیتمان هەیە.

سواری عەرەبانەی گا بووم و جێگەمان ناخۆش بوو، خۆمان فڕێدایە خوارێ و بلیتەکەمان دایە دەستی. تەماشای پشتەکەی کرد و وتی: «ئەمە ماوەی تێپەڕیوە.» وتم:

- ماوە مانای چییە، بۆچی ئەمە میوەیە تا کاتی بەسەرچووبێ؟

- چەنەبازی پێ ناوێ، یەڵا بۆ خوارێ، شەمەندەفەر ئەجووڵێ.

بە زۆر کردینییە خوارێ و ئێمە دەستمان کرد بە پرتوبۆڵ، فەرمانبەرێک لەولاوە هات و وتی:

- ئەوە بۆڵەبۆڵی چیتە؟

- بلیتم پێیە و لە شەمەندەفەریان دابەزاندم.

وتی ئا بزانم بلیتەکەتم نیشان بدە. جا وتی:

- بەسەرچووە.

- وتم خۆ ئێمە لە وێستگە دانەبەزیوین.

- ئەی لە کوێ؟

- لە ڕێ دابەزین، خوێنمان لەسەر شەمەندەفەر، وەخت بوو هەردووکمان ئەستۆمان ورد بێ. بازمان دایە خوارەوە.

- شەمەندەفەر بەڕێوە بوو؟

- ئەریوەڵا ئەڕۆیی. بەڵام تووشی بەرەوژووریيەک هاتبوو زۆر ماندوو بوو، خەریک بوو وچان بدا، ئێمەش خۆمان خستە خوارێ.

سا من وام وت و تەنگەی گرتم. بردمیە ژوورێک کە سێ چوار کەسی لێبوو. لەوێ وتی ئەمانە لە شەمەندەفەر بازیان داوەتە خوارێ. پیاوێکی ڕیشداریان تیابوو، وتی:

- جەزایان لێ بسێنن.

- ئێوە ئەبێ جەزا بە ئێمە بدەن، ئەوەی شەمەندەفەرەکەی ئێوە بە ئێمەی کرد، کەس بە کەسی ناکات.

کە تێفکرین بە خوایشت پارە نادەین، پۆلیسیان بانگ کرد و بەزۆر بیست مارکیان لێسەندین. فریدریک خراپ تووڕە بوو، وتم:

- بۆچی تووڕە بووی؟

- لە تۆ تووڕە بووم، تۆ چیت داوە لەو هەموو قسەکردنە، لە هەموو شوێنێک ئەڵێی بازمان دا، وەک ئەوەی قەڵای دمدمت گرتبێ، ئەگەر نەتوتایە کێ ئەیزانی؟

- چۆن کێ ئەیزانی، خۆمان خەبەرمان نەدایە جەزاکەی زۆرتر بوو، ئەسا خاوەنی گاجووتەکان شکاتیان ئەکرد و ئەیانوت گاجووتەکانیان بەجێهێشتووین.

- بەم عەقڵەوە ئەبی بە مێردی میکایلا، ئەگەر تۆ خۆت ئاشکرا نەکەی کێ تۆ ئەناسێ؟

- قسەی قۆڕ، جەنابی ئەلفرێد مۆلەر ئەفەندی کێ نایناسێ.

- های ئەلفرێد، چالم بەسەر منیشا.

کە ڕاستی تێفکریم ئاشتم کردەوە. هاتین لە گۆشەیەکدا دانیشتین، ماندوو و مردوو، بیرم لە حاڵی خۆم کردەوە، ئیتر پارەشم نەمابوو، چاوم لێک نا. بە حاڵی سەرگوزەشتەی خۆما هاتم: منداڵێکی لادێی بێخەم، لە دێیەکی دەر کەنار، هەوایەکی ساف، زەوییەکانمان لە نزیک ئاوایی بوون و ئەرکێکی وام بەسەرەوە نەبوو. بە خۆڕایی باوکم دەری کردم، من نەبێ کێ باوکی دەری کردووە! لەوێ کە هاتمە دەرێ و لەسەر ڕێ تووشی فریشتەی خۆم هاتم، لە خزمەت میکایلادا چەند خۆشم ڕابوارد. زەمانە وایە، هێشتا لەزەتم لە میکایلا نەدیبوو، ئەو سەفەرەمان هاتە پێش، ئەو کەوتنە خوارەوەیەم، ئەو ترسە. دوای ئەو هەموو فەلاکەتە ئێستاش ئەم بێپارەییە. خەمم لێ نیشت و کەمانە خەمڕەوێنەکەم دەرهێنا، فریدریک نووستبوو. دەسم کرد بە کەمان لێدان و ئەویش خەبەری بووەوە و بەستەیەکی «هۆغۆ» «بێکەسی» چڕی. من لێمدا و ئەویش لەسەر کەمانەکە وتی. هەموو خەڵکی ئەساسیۆنەکەمان لێ کۆبوونەوە و هەروا پارەیان بۆ فڕێ ئەدایـن، شەبقەکەم گرتبووەوە و پڕیان کرد لە پارە. کابرای شەمەندەفەرچی کە جەزای لێ سەندبووین هات و وتی: «حەیفە جەزامان لە ئێوە سەندووە.» جا بەقەد جەزاکە پارەی کردە شەبقەکەمەوە.

دوایی بردمە بەردەمی و وتم: «بۆم بژمێرە، بزانە بەم پارەیە دوو کەس ئەگەیەننە ناپۆلی.

پارەکەی ژمارد و وتی: «بەشی بلیتی دوو کەس زیاترە، جگە لە پارەی بلیت، بیستوپێنج مارکەتان زیادە.» وتم: «ئەویش بۆ جەزای شەمەندەفەرچییەکی تر، هەمووتان پێمان فێرن کە جەزامان لێ بسێنن.» دەستیان کردە پێکەنین و یارمەتیان داین، بلیتیان داینێ و وتم: «ئامان ئێستە مەیبرە تا شەمەندەفەر دێت، وادەی بەسەر ئەچێت.» وتی: «نا نا، نایەڵین بەسەر چێت.» دانیشتین تا شەمەندەفەر هات، شەمەندەفەرچی خۆی هات و بانگی کردین، بردینییە هارگۆنێکەوە و زۆرمان پێ خۆشبوو.

وتم: «فریدریک، وا ئەمجارە بە ڕاستی لە شەمەندەفەردا ئەچین بۆ ناپۆلی.» من هێشتا خۆشی خۆیشم تەواو نەبووە، قاپی کرایەوە و ژن و پیاوێک هاتنە ژوورەوە. تەماشای ئێمەیان کرد، ژنەکە سەری نایە بناگوێی پیاوەکە و پێکەنی. منیش وتم: «فریدریک، سەیری ئەم مەخسەرەیە کەن.» ئەموستم بۆ ڕاهێشت و پێکەنیم، پیاوەکە تووڕە بوو و وتی: «ئێوە بێتەربیەتن، پێمان پێدەکەنن!»

«بێعاری چاک ئێوەن کە لە پێشدا ژنەکەت پێکەنی.» کابرا کە زانی لە پێشچاوی ژنەکەی لێی ئەدرێ، دەنگی لە خۆی بڕی و ئیتر دەنگی نەکرد. فریدریکیش وتی: «ئەلفرێد، تۆش بە سەریا مەچۆ، وازمان لە یەک هێنا.» ئەوان لە پەڕێکەوە دانیشتن، ئێمەش لە پەڕێکی ترەوە. ئافرەتەکە بە مێردەکەی وت: «تۆ لە دەرەوە هێندەت پەلەپەل لێکردم، نەتهێشت هیچ بخۆم. ئەوەتا ئێستا برسیمە.»

مێردەکەی لە ڕەفەی شەمەندەفەرەکە سەبەتەیەکی داگرت کە پڕ بوو لە پەنیر و باسورمە و سجووق و خواردەمەنی. ئافرەتەکە ملچەملێ دەستی کرد بە خواردن، لەو ساتەدا بیرمان کەوتەوە کە ئێمە لە دوێنێ ئێوارەوە هیچمان نەخواردووە. سەرم نایە بناگوێی فریدریک و وتم:

- با داوای نانێکیان لێبکەم.

وتی:

- هیچ هەڵناگرێ، ئێمە لە پێشدا شەڕێکی وامان دامەزراند کە ئیتر ڕوومان نەیەت لەگەڵ یەکتری بدوێین.

- ئینجا چییە، پارەیان ئەدەینێ.

- باشە خۆ ئەوان لە شەمەندەفەرەکەدا نانەواخانەیان دانەناوە.

- ئێ ئەگەر بە پارە نەیاندا، بەزۆر لێیان ئەسێنین.

- ئەها، سەری بێکەسەیە!

- ئەرەوەڵا برسییەتی ڕەگی هاری پێوەیە و ئیتر هیچ ناوەستم.

نەوەستام و چوومە بەردەمیان، پیاوەکە بە مۆنییەوە لێم مۆڕ بووەوە و وتم: «ڕاوەستە تووڕە مەبە، دوو قسەت پێ ئەڵێم و ئەگەر بە دڵت نەبوون ئەتوانی تووڕە بی. با وەجوو لە تووڕەبوونیشدا زیان نەکەی.»

دەستم کرد بە گیرفانما و هەندێ پارەم دەرهێنا، وتم: «لە ماڵی خۆمانەوە نەهاتووین و لە بیریشمان چوو لە دەرەوە نان

بکڕین. وەرە پیاوی چاک بە بایی ئەم پارانە نانمان بدەرێ.»
دوو نانی هۆقەیی «بەیتوونی» دامێ و پارەشی لێ وەرنەگرتم. هێشتا پارووەکەمان لە دەما بوو، کابرایەکی درێژی شەپقەچوارکووی دووگمەسپی هاتە ژوورەوە و گازێکی کۆنکەرەی بە دەستەوە بوو و داوای بلیتی کرد. ئەو ژن و مێردەکەی کە نانیان دابووینێ لە پێشەوە بوون، بلیتەکەی ئەوانی لە پێشەوە وەرگرت، دایە بەردەمی گازەکە و کرتەیەکی لێ هەستاند. کونی کرد و داوای بلیتی ئێمەی کرد، وتم: «جارێ ڕاوەستە دەمم گیراوە.» خەریک بوو دەست بکا بە دەمما، وتم:

- ئەوەی چی دەکەی؟

- وامزانی بلیتەکە لە دەمتایە، وا ئەڵێی دەمم گیراوە.

- وامزانی تیکەکەم لە دەم ئەڕفێنی، ئەڵێن سواڵکەری گرانی تیکە لە دەم ئەڕفێنێ. باوەجوو نانەکەش هی خۆمان نەبوو، ئەو ئافرەتە بە خێری خۆی دابوویێ.

- دەک خێری نەنووسێ. زوو کە، بلیت! با زیاتر پریشکی ئێوەم پیا هەڵنەپەڕێ.

بلیتم دایێ و ئەویشی کون کرد. خەریک بووم یەخەی بگرم کە بۆچی کونی کرد، زوو قاپی کردەوە و بازی دایە خوارەوە. ڕوانیم نەچووبووە خوارەوە، منیش دەرگام کردەوە تا بزانم لە کوێوە ڕۆیی. مێردی ژنەکە وتی:

- شەمەندەفەر لە ڕۆیشتندایە، قاپی بکەیتەوە، جەزات لێ ئەسێنن.

- ئەی بۆچی لەوی ناسێنن؟

- ئەو شەمەندەفەرچییە.

لەگەڵ کابرا کەوتینە گفتوگۆ و لێی پرسیم:

- تۆ بۆچی ئەچیت بۆ ناپۆلی؟

لە پێش منا فریدریک وتی:

- لە شوێن دەزگیرانەکەی ئەگەڕێ، لێی گووم بووە.

لەولاوە ژنە دیسان پێکەنی و وتی:

- دەزگیران چۆن ون ئەبێ؟

من تووڕە بووم، مێردەکەی وتی:

- لێی مەگرە، منداڵە.

- ئۆف بەخوا منداڵی چاکە، بەخوا چلە و تەوقی ملە.

ئینجا ژنە ئاگری تێبەربوو و کەفی سەند. نەیدەزانی چۆن جنێو بدات، وتی:

- ئەوە مێردەکەم لێی بپرسە، هێشتا حەوت مانگە شووم کردووە و منالیشمان نەبووە.

- چەندەمین شووتە؟

- تف لە تۆ، کچ بووم، بە منداڵی بنم پڕاوە و ڕووسووریم نەمابوو.

- ها، ئەگەر کچ بوویتایە، هەڵبەت ڕووسوور ئەبوویت. با کچیش بووبی، لە دێی ئێمە کچی وا مابۆوە کە بە چل ساڵی شووی کرد و لە تۆش جوانتر بوو.

ئیتر ئافرەت دەستی کرد بە گریان و ئەیوت ئەمەم بۆ بکوژە، وتم:

- خوێنی ماڵی باوکت زۆرە.

- پارەی دارایی، خۆم خوێنی ئەدەم.

ئێمە لەم شەڕەدەنووکەدا بووین کاتێ شەمەندەفەرچی گەیشتە ئەساسیۆن و پرسیم:

- ئەمە ناپۆلییە؟

وتیان:

- بۆ ناپۆلی، شەو و ڕۆژێکتان ماوە.

لەو کاتەدا تێفکریم و کابرای تەگەئەستوور هاتە ژووریێ، شێوەی لە قەسابەکە ئەکرد کە لە ویانە گاجووتەکانی هێنابووە شەمەندەفەر. وتم:

- یاخوا بەخێربێی، گاجووتەکان بە سەلامەت گەیشتنە بەرەوە؟

کابرا واقی وڕما و وتی:

- گاجووتی چی؟

· ها، ئەو گاجووتانەی کە لە ویانە سواری شەمەندەفەرت کردن.

- تۆ من بە کێ ئەزانی؟

- بە قەسابە ئاشناکەی خۆمان.

- بە چیا ئەزانی کە من قەسابم؟

- بە سەروگوێلاکتا.

- تۆ منت نەناسی، بەڵام من ئێوەم ناسیی.

- ئێمە کێین؟

- دیارە کە دۆمن.

کە ئەو ئەم قسانەی لە دەم ترازان ژنەکە لەولاوە دایە قاقای پێکەنین و ڕووی کردە کابرای قەساب و وتی: «ئای قوربانی دەمت بم، ئەوا هیچم لە دڵا نەما، من تا ئێستا نەمدەوێرا بیڵێم، وا شوکر تۆ وتت.»

جارێ وازم لە قەساب هێنا، پێم وت: «ئاغای قەساب، تۆ چەوتە و شیلەی ئەم ئافرەتە بگرە، خۆ بە دەم و شیلەدا حەیوانی ئەناسی، بزانە لە چل ساڵ بەرەوژوورتر نییە.» لەولاوە مێردی ئافرەتەکە ڕاست بووەوە و لە قینا ئەلەرزی، وتی: «ئێوە گەیشتنە ڕادەیەک کە گاڵتە بە خانمی من بکەن؟ سا ڕاوەستن بزانن ئێستا نیشانتان ئەدەم.» فریدریک سەری نایە بناگوێم و وتی: «ئەلفرێد، ئەم کابرای قەسابە ناتوانێ لە شوێنی خۆیدا بجووڵێ، ئافرەتیش هیچی لە دەست نایە، با هەستم تێر و پڕ بیکوتم.» وتم: «فریدریک، نان و نمەکمان کردوون، لێیان گەڕێ.» بە کابرای وت: «ئێمە نانی ئێوەمان خوارد، ئەگینا ئەمزانی کە چۆن داتئەنێمەوە. تۆ بە ژنەکەت بڵێ

بێدەنگ دانیشی، ئێمەش هیچ نالێین.» مێردی ژنە دانیشتەوە، ئینجا نۆرە هاتە سەر قەساب، وتم:

- بەڕاست گاجووتەکان هی تۆ نەبوون؟

- تۆ جارێ پێم بڵێ ئەسڵەن کوێندەریت؟

- ئەڵمانی.

- ئەڵمانی چ شوێنێکی؟

- باوێرا.

- چ دێیەک؟

- دەمێکە هاتووم، وا ساڵی بەسەردا تێ وەرئەگەڕێتەوە، ناوی دێکەی خۆمانم لە بیرچۆتەوە، ئەی بەڕاست، تۆ کێی؟

- ئەوقاتم.

- ئەوا ناوێکم بیست، کە تا ئێستا نەمبیستبوو.

- ئەوقات بەری چ دارێکە؟

- بەری خوێندن و زانیاری و حقووقە.

- خۆ منیش هێندەی تۆم خوێندەوە، بۆچی نازانم ئەوقات چییە!

لەم گفتوگۆیەی ئێمەدا دیسان ژنەکە هەڵی دایێ و وتی: «تۆ چ تاقەتێکت هەیە کە ئەمەندە لەگەڵ ئەمانەدا ئەدوێی؟» تەمام بوو جوابی بدەمەوە، کۆنەقەسابی تازە ئەوقات بە دزییەوە وتی: «تووخوا دەنگ مەکە، ئافرەتە.» منیش بە قسەم کرد. بەم بەزموڕەزمە نزیک ئەساسیۆن کەوتبووینەوە. ڕوانیم ئافرەت

زوڵفی خۆی بە شانە ئەکات، خۆی ڕێک ئەخات، پیاوەکەشی جانتا ئامادە ئەکات. گەیشتینە ئەساسیۆن و دابەزین و دوعاخوازیان نەکرد و منیش نەمکرد. نامەردیی دوو مارکم دەرهێنا و هاویشتم و دام بە سەروسوورەتی ئافرەتەکەدا، بانگم کرد: «ئەوە پارەی نانەکەیە کە لێرە پێتان فرۆشتین، با لای خەڵک نەڵێن مۆلەر ئەفەندی پارەی نانەکەی نەدا.» هەرچی خەڵک هەبوو کە لە ئەساسیۆنەکە ڕاوەستابوون، دایانە قاقای پێکەنین. کابرا هار بوو و گەڕایەوە دواوە و تا خوا هێزی دابوویە، گۆچانێکی ئاراستە کردم. من خۆم کێشایە دواوە و گۆچانەکەم بەرنەکەوت. خۆی بە دەمدا کەوت و شەمەندەفەرچییەکان قاچیان گرت و ڕایانکێشایە دواوە، شەمەندەفەریش کەوتە جووڵان. هەڵسابووەوە بە گۆچانەکەیەوە بە شوێن شەمەندەفەرەکەدا ڕای ئەکرد و خەڵک پێی پێدەکەنی. ئەوقاتیش لە ئەساسیۆنێکی تر دابەزی و ماینەوە بەس خۆمان. وتم: «فریدریک، تووخوا با خۆمان بەزمێ بگێڕین.» دەستم دایە کەمان و لێمدا، فریدریک وتی: «لەمدیو ئاقوردم کرد.» من لەو دیوەوە زۆر ئافەرینیان کردبووین، کەچی لە پشتمانەوە کابرایەکی منگن، بانگی کردین: «بەم شەوە ئەمە چ ڕەزالەتێکە؟ خەوتان لە ژنەکەم هەراسان کرد.» لە پێشمانەوە دەستەیەک کوڕگەل بە وەحەوەحە بە کابرایان وت: «ژن ئەگەر ژن بێت چۆن حەز لەم ئاهەنگە ناکات، بەڵام وادیارە تۆ دڵت پیسە، ئەڵێی نەکا ژنەکەم عاشقی ئەم کوڕانە بێت هەی منگن.»

«ئەم بێشەرەف و بێحەیایانە کێن، من ئافرەتم لایە و ئەوانیش کەرێتی ئەکەن.» ئیتر لەولاوە بوو بە شەڕەجوێن و

ئێمەش ناچار ئاهەنگەکەمان بڕییەوە و لێی ڕاکشاین. چاومان نەچووبـــووە خەوەوە زرمەیەک لە شـــەمەندەفەرەوە هـــات. شەمەندەفەر وەک بڵێی لە شاخێک کەوتبێ، گەڕایەوە و بە لادا هـات. مـن سـەرم بەر تەختـە کەوت و شـکا، جـاریَ هەوڵـێ هـاوڕێکەمم بـوو، بـانگم کـرد: «فریـدریک، فریـدریک.» هـیچ وەڵامێ نەبوو. کەوتمە مەراقەوە و چراش کوژابووەوە، دیسان بانگم کرد و بە ئاستەم نووزەیەک هات. بە پەلەکووتێ چووم دۆزیـمەوە، وتـی: «ئەلفریـد، تەواوی پـارچەی فـارگۆنەکە کەوتووە بەسەر پێما و لاقم شکاوە، ئاخۆ ئەم نەگبەتییە چیبوو بەسـەرمانا هـات، هەر ئەمەمـان مـابوو.» گوێقـوڵاغ بـووم، لە دەرەوە دەنگـی خەڵـک نەهـات. لە شـوێن بریـندار ئەگەڕان، تـــــوومەز شــــــەمەندەفەرەکە لە ئەساســـــیۆنەکە لەگەڵ شـــەمەندەفەرێکی تـــر بەر یەک کەوتبـــوون. وەرگەڕابـــوو و شکابوو. هاوارم کرد و هاتن دەستەبەرەیان پێبوو، فریدریکمان هەڵگرت و منیش لەتاوا برینی سـەرم لە بیر چووەوە. شوێنی کەوتم و گەیشتینە نەخۆشخانە، لەوێ قاچی ئەویـان گرتەوە و سـەری منیـان دەرمـان کـرد، وتیـان: «مەترسـن، هیچـی واتـان نییە.»

عەرەبانەیەکیـان هێنـا، ئێمەیـان سـوار کـرد و بردینیـانە قۆنـاغێکی گەورە، بە عەرەبـانەوە بردینیـانە ژووریَ و ژن و پیاومان لێ کۆبوونەوە. ئیکرامێکی زۆر! چاو و قاوە و شیریان بۆ هێنایـن. پیاوێکی کەڵەگەتی نوورانی هـات و هەواڵی پرسـین، دڵخۆشـــی دایـــنەوە و زانـــیم کە ئەمە پیـــاوێکی گەورەیە کە فەرمانبەری نەخۆشخانەکە شەپقەی بۆ داگرت و کڕنووشی بۆ کێشـا. منـیش تەعـزیمم بـۆ کـرد و وتـم: «ئـێمە بە فەلاکەتـی

خۆمان خەفەتبار نین، بەم نیوەشەوە ئێوەمان لە خەو ڕاپەڕاند و ناڕەحەتمان کردن.» وتی: «نەخێر، ئێمە مەمنوون ئەبین و بە دڵ ئیسراحەت ئەکەین ئەگەر فریای فەلاکەت و زەردەیەک بکەوین. ئەوی پیاو بێ و ویژدانی هەبێ، ئەزانێ کە خوا بۆ ئەوە دەوڵەتی داوە کە خزمەتی لێقەوما و هەژارانی پێ بکا و خوێندەواریان پێ بگەیەنێ، تا بە خوێندن خزمەتی وڵاتەکەیان بکەن. ئێستا چەند ڕۆژێک لێرە بحەسێنەوە و دوایی خوا کەریمە.» بەزۆر یەک دوو ڕۆژ بەندیان کردین، سەر و پێمان چاک بووەوە و خزمەتکاری زۆربەمان کچێکی جوان بوو، بە فریدریکم وت:

- کاکە ئەم کچە لە بەرتای دەستگیرانی تۆ دەکات.

کچەکە وتی:

- بەرتا لە کوێیە؟

- لە ناپۆلی.

- زۆر جوانە؟

- بەڵێ زۆر جوانە، ئەگەر لە ئەندازەبەدەر جوان نەبووایە چۆن ئەموت کە لە تۆ دەکات!

کچەکە پێکەنی و وتی:

- ئەی خۆت دەستگیرانت نییە؟

فریدریک وتی:

- بەڵێ، ئەو میکایلا دەستگیرانییەتی، کە بەرتا کارەکەری ئەوە.

- کەواتە ئەو بۆ کچی ئاغا و تۆش بۆ من.

وتم:

- ئاغاکەت کێیە؟

- ئەوە بوو کە هات خۆشی و چلۆنی و بەخێرهاتنی کردن. یەکەم پیاوی ئەم شارەیە، زۆر دەوڵەمەندە و ناوی مسیۆ «قولمار»ە.

ئیتر نووستین و بەیانی بەرچایی و شیر و چامان خواردەوە و دوعاخوازیمان کرد و هاتینە دەرەوە. لە دالانەکە کچەکە هات و بە دزییەوە کیسەیەکی ئاوریشمی سپی دامێ، کە هاتینە دەرێ ژماردم سێ لیرەی زێڕی تیابوو. ئیتر لە خۆشیانا هاتین بە ڕێوە. بڕیارمان دا جارێکی تر سواری شەمەندەفەر نەبین و بە پێ بە ڕێی شەمەندەفەرەکەدا بڕۆین. ملی ڕێگەمان گرت و هەروا بە ناوەڕاستی هەردەە لای ئاسنەکەدا ئەڕۆیشتین. شەو گەیشتینە سەر پردێک و لە سەرەوە سەیری پردەکەمان ئەکرد. تێفکریم لە پێشمانەوە دوو چاوی تیژ وەک ئەژدیها ڕووبەڕوومان هات و پریشکی ئاگری لێ ئەبێتەوە. وتم: «فریدریک، ئەی نامەرد فەوتاین، ڕزگارمان نابێ.» وتی: «با خۆمان فڕێ بدەینە ئاوەکەوە.» وتم: «مەلە نازانم ئەخنکێم، با خۆمان بە کەناری پردەکەدا هەڵواسین تا شەمەندەفەر ئەڕوات، دوایی خۆمان ئەخەینەوە سەر ڕێ.» من لە دیوێکەوە و فریدریک لە دیوەکەی ترەوە خۆمان بە کەناری پردداهەڵواسی. من نەمزانی سەرم لادام، کە شەمەندەفەرەکە هات، لرفەلرف ئاوی کولێوی کرد بە سەر و چاوما و

دەموچاوم سووتا، دەستم برد دەموچاوم بسڕم، فلق کەوتمە ئاوەکەوە.

ئێستا وا ئەلفرێد ئەفەندیمان لە ئاوا بەجێهێشت، ڕەنگە ئەوانەی گوێ لەم سەرگوزەشتەیە ئەگرن، بەزەییان بە ئەلفرێددا بێت. کوڕێکی دەروونساف و دڵپاک و ڕەوشتچاک و بەوەفا و سەودا، لە عەشقی جانانا و لە یار بێخەبەر، ئەو لە ڕێی دا بخنکێ، زۆر ناخۆشە. لەبەر ئەوە پیرەمێرد خەبەرتان ئەداتێ ئەلفرێد هەرچەند بە خنکاو ئەژمێردرێ بەڵام نەمردووە و ئێستا وا لە قۆخەڵی لادێیەکدا ڕایان کێشاوە و ئاویان لە زگ دەرهێناوە. ئەیشێلن، تاکوو خوێنی بجووڵێ و بێتەوە هۆش خۆی. جارێ با ئەو لەوێ بێ، فریدریک بۆمان بگێڕێتەوە کە چییان بەسەرهاتووە.

فریدریک ئەڵێ: « کە شەمەندەفەر ڕووی تێکردین، لەسەر پرد بووین و نەمانتوانی خۆمان لە ڕێی لادەین. چارمان نەما و ئەمدیو و ئەودیو خۆمان بە لێواری پردەکەدا هەڵواسی، شەمەندەفەر بە تەوژم هات و ئاوی گەرمی پرژاند بە سەر و گوێلاکماندا و من سەرم لەبەر شاڵاوی ئاوە کوڵاوەکەدا لادا و زۆری نەمابوو دەستم بەربێت. بە هەر ڕەنگێ بوو خۆم گیر کرد و شەمەندەفەر تێپەڕی، هاتمەوە سەر پرد و ڕوانیم ئەلفرێد دیار نییە. بانگم کرد، هیچ وەڵام نەبوو، بەڵام کاتێ ئاوە گەرمەکەم بە ڕوودا هەڵپژا، شڵپەیەکم هاتە بەر گوێ و وەک دەنگی ئەلفرێد وابوو هاوار بکات. ئیتر گوێم لە هیچی تر نەبوو، بە هەموو لایەکدا هاوار و بانگم کرد، لە هیچ لایەکەوە دەنگ نەبوو، گریام ئامان ئەلفرێد تۆ لە کوێی!، هیچ.

ئیتر بۆم دەرکەوت کە دەستی بەربووە و کەوتووەتە ئاوەکەوە. لە تاوا خۆم فڕێدایە ئاوەکەوە و نەمزانی ئاوەکە لەو ڕاستەدا ئەوەندە قوڵە و خوڕە، دەربەستی خنکان نەبووم. هەر بە مەرجێ ئەلفرێد نەخنکابێ و چاوی بە میکایلا بکەوێتەوە، من سەدجار شوکر بووم کە لە باتی ئەو بخنکێم. زۆر مامەوە لە ئاوا، کە من ئەلفرێدم لەدەست چوو قیروسیا با منیش بخنکێم. چی بکەم، کە ئەجەل نەهات بەزۆر نییە. شەپۆل فڕێی دابوومە کەناری ئاوەکە و بێڕۆخ کەوتبووم. بەیانییەکەی لادێی هاتبوون و بۆ ئیش و منیان بە بێهۆشیی دیبوو، دابوومیان بە کۆڵیانا و بردبوومیانە ماڵی خۆیان. ئاگر بۆ کردبوومەوە و هێنابوومیانەوە هۆش خۆم. لە پاش ئەوە، کە هاتبوومەوە هۆش، دیسان ئەلفرێدم بانگ کردبوو و وەلامی نەدابوومەوە. ئینجا شێت بووبووم، هەستابووم ڕام کردبوو و وتبووم: ئەچم شەمەندەفەر ئەکوژم، پرد ئەڕوخێنم، سەرەوژێری ئەکەم چونکە هاوڕێکەمی لەناوبردووە. بە زۆر گرتبوویانم و بەستبوویانمەوە، تا سێ ڕۆژ ئینجا ئەقڵم هاتبووەوە کەللەم. خوا ناخوا ماڵ ئاوایم لەو ماڵە بەڕەحمە کرد و گۆرانیم ئەوت، هەرچی لەو ڕێیەوە ئەڕۆیی گلی ئەخواردەوە و هەندێ لەگەڵیشم ئەگریان. تا ئێوارێ گریام و بڕیارم دا ڕاوەستم، تا شەو کە شەمەندەفەر هات، خۆم بخەمە بەری و منیش لە پاش ئەلفرێد نەمێنم. لە غەیبەوە یان لە خەیاڵەوە، دەنگێکم هاتە گوێ، لە دەنگی ئەلفرێد ئەچوو. ئەیوت خۆت مەکوژە، بچۆ هەواڵ بگەیەنە بە یارەکەم کە بە عەشقی ئەوەوە مردن شەهید بوونە.

ئەم دەنگە هات بە ئەقڵما کە بچم دەزگیرانەکەی بدۆزمەوە، هەواڵـی بـدەمێ کە ئەلفرێـد لە ڕێـی ئەوا چـوو. هەر ڕاسـت بوومەوە، ئەو شوێنە شـوومەم بەجێهێشت. تا هێزی پێم بوو ڕامکـرد، تـا لە چـاو ون بـووم و ئینجـا لە خـۆمەوە تووشـی مەقامێک هاتبووم. لە ڕاکردنا، لە وەستانا، دانیشتنا هەر بانگم ئەکـرد ئەلفرێـدم، هێشـتا ئەو شـیعرانەم لە بیـر مـاوە کە بـۆ ئەلفرێدم هەڵبەستبوون. بە شێنەیی ملی ڕێم گرت، ئەوەندە کە لەگەڵ ئەلفرێد بەیەکەوە سەرگوزەشـتەمان بەسـەردا هـاتبوو، من دوایی زیاترم دی لە ڕێ و بان. پاپۆڕێک بۆ ناپۆلی ئەچوو، بە دزییەوە بە تەنـاف و قولاپدا هەڵگەڕام و لەنـاو پـاپۆڕەکەدا خـۆم شـاردەوە، تـا گەیشـتە نـاپۆلی. لەوێ لە پـاپۆڕ هـاتمە دەرەوە و سـەرنجم دا قەرەبـاڵغ بـوو شـوێنەکە، تـێکەڵ بە حەشامەتەکە بووم و نەمئەزانی چی بکەم. عەرەبانەیەکم دی، چووم لە خۆمەوە دەرگاکەیم کردەوە و دانیشتم. عەرەبانەچی هات پەلی ڕاکێشام کە بمهێنێتە خوارێ، زللەیەکم لێدا، چووین بە گژ یەکدا و خەڵک هات وتیان:

- چیت ئەوێ

- قەسری میکایلا.

- لە کوێیە؟ ناونیشانی چییە.

- میکـایلا، دەسـتگیرانەکەی ئەلفرێـد، بەو نیشـانەیەی تەڕپیرێکیشیان لەگەڵە.

- نون قاپیشو.

دایانبەزاندم و هەرچی تووشی ئەهاتم، ئەمپرسی میکایللا. ئەیانوت: «نون قاپیشو.»

سەد نون قاپیشویان پێ وتم.

سێ شەو و سێ ڕۆژم بەم نونقاپیشویە ڕابوارد. تا ڕۆژێکیان لە دوکانی فۆتۆغرافچییەک وێنەی ئەلفرێد لەودیو شووشەی دوکانەوە هەڵواسرابوو. پەلامارم دایە شووشە و شکاندم، وێنەکەم گرتبە باوەش و بێهۆش کەوتم. کە هاتمەوە هۆش خۆم لە ئەجزاخانەیەک دەستیان دەرمان کردبووم، کە شووشەکەم شکاندبوو دەستم زۆر بریندار بووبوو. بێهۆش بووبووم و وێنەکەم لە باوەشدا بوو. بە بێهۆشیش بەرم نەدابوو، لێیان پرسیم:

- ئەمە کێیە.

- برامە و لە ئاوا خنکاوە.

- کورە ئەمە زیندووە، سێ ڕۆژە ئەم وێنەیەی گرتووە، بەڵکوو یەکێک بێت لە براکەی تۆ بکات!

- نەخێر، هی ئەوە و خنکاوە.

پیاوێک وتی:

- ڕاوەستە بتنێرمەماڵی ئەو پیاوە ماقووڵە.

عەرەبانەچی بانگ کرد و سوار بووم. لە خۆشیانا لەناو عەرەبانەدا نەوەستام و خۆم کوتایە لای عەرەبانەچییەکە. «وڵاخەکان گورج لێخوڕە.» دانەویمەوە زللە لە وڵاخ بدەم، شلپ کەوتمە خوارێ و دەستم بریندار بوو و سەرم شکا،

عەرەبانەچی دابەزی بە هەزار حاڵ سواری کردمەوە و گەیشتینە بەر دەرگایەکی گەورە. بە ئیشارەت وتی: «ئەوەتا.» خۆم فڕێدایە خوارێ و ڕامکرد بچمە ژوورێ، عەرەبانەچی لە پشتەوە چاکی ڕاکێشام و من ئەوم ڕاکێشا. توومەز داوای پارە ئەکات. من لە خۆشیانا نەمپرژا تا پارەی بدەمێ، لە مشتومڕی ئێمە قەرەباڵغییەک کۆبووەوە و خەڵکی ئەو قۆناغەمان بەسەردا ڕژا. پیاوێکی گەورە هاتە دەرێ و لە عەرەبانەچی تووڕە بوو، بە ئیتالی پرسی: «چیت ئەوێ؟» وتی: «پارەی نەداوە.» لیرەیەکی بۆ فڕێدا و وتی: «بڕۆ.» کە ڕوانیم، ئەلفرێدە. بەو دەستە بریندارەوە و بە خوێنی سەرەوە پەلامارم دا و خۆم بە ملیا هەڵواسی. تێر ماچم کرد و بردمییە ژوورێ، دکتۆری خۆیان هێنا، سەری شووشتم و دەرمانی لێدا. ئێستا وا لەگەڵ ئەلفرێد لە ساڵۆنی قۆناغەکە دانیشتووین.»

هانام بەو وەخت و سەعاتە ئەوەیە کە وەک چۆن ئەم دوو برادەرە بە یەک گەیشتنەوە، ئەوهاش هاوڕێکانی میلەت و نیشتیمانەکەشمان دەربارەی یەک وابن و لە ڕێی خزمەتی نیشتیماندا بەوەفا و ئیقدام و خزم و خۆشەویستی یەک بن. ئینجا هانام بەو دەمەی کە ئەلفرێد بە وەسڵی میکایلا شاد بوو. منیش ئەو کچە جوانەی کە لە دیباچەی ئەم جلدەی دواییدا نووسیومە، ئەم بەهارە تووشم بێتەوە بە عەشقی ئەو ڕوومەتە جوانەی کە بریقەی دەهات و لەسەر جلدی یەکەمی ئەم کتێبە، منی شەیدا کرد. ئەمەشم بۆ تەواو کرد، بەڵکوو ئارەزووی ئەسەرێکی وەک ئەو جوان بێنمە مەیدان.

بەڵام درێغ و ئەفسووس کە نە ئەو ناسراوە و نە من. ئەو گوڕەم ماوە کە ڕەنگە خوێندەوارەکان بپرسن، ئەلفرێد چۆن گەییوەتە ئەوێ؟ چۆن خانمەکەی دەستکەوتووە. یەکەم جار فریدریک لێی پرسی: «ئەلفرێد، چۆن ئەم مەحبوبی جیهان و پرێنسی ئیتالیایە بە تۆ بڕاوە؟» وەڵامی دایەوە: «فریدریک، سەرگوزەشتەی ئێمە سێ شتی تیایە کە لە سێ شت چاکترە. یەکەم دەروون و نیەتی پاک و چاک، لە ئاین و ئۆینی سیاسەت و دیبلۆماسی باشترە. دووەم: وەفاکاری لە جوانی باشترە. سێیەم: ئەخلاق لە پارە پەسەندترە. من دەروونێکی پاکم بوو، لادێیەکی بێ فڕوفێڵ بووم، کە تووشی میکایلا هاتم، سەفەرەکەم کاری تێکرد و تا ئەهات لە لای پەسەند ئەبووم. دووەم لە وەفادا، لە مێردە کۆنەکەی بۆی وەفادارتر بووم و وەفای من پێش زۆر داواکاری تر کەوت. سێیەم ئەخلاقی من و عەشقی من وایکرد قەناعەت بەو ڕاستییە بکا کە لە هاوسەرێتیدا، عەشق و ئەخلاق، لە سەرسەرێتی و گەورەیی و ساختە و قومار و سەرخۆشی، بۆ ئافرەت چاکترە. من خنکان و حەپس و تێهەڵدانم بۆ عەشقی ئەو فەرامۆش نەکرد، دەستم لە وەفا بەر نەدا و تا دەستم لە ملی یار ئاڵا. تۆش کە یاری وەفاداری من بووی، هێندەی من و بەڵکوو لە من زیاتر بەکێش بووی، وا گەیشتیتە مەرام و من و میکایلا، (بەرتا)مان پێشکەش کردی، کەوایەکی سوورمەیە بەرتا. ئەم جلانە داکەنە و ئەو بکە بە بەرتا.»

## ژياننامەی نووسەر



هانس کریستیان ئەندرسن نووسەرێکی دانیمارکییە، لە ساڵی ١٨٠٥ لە بنەماڵەیەکی هەژار لە دایک بووە و لە ساڵی ١٨٧٥ لە کۆپنهاگن کۆچی دوایی کردووە. باوکی پێڵاودروستکەر بووە و دایکیشی وەک خزمەتکار لە ماڵە دەوڵەمەندەکان جلی شتووە. تەنها یەک خوشکی هەبووە.

ئەندرسن ژیانێکی پڕ مەینەت و ناهەمواری بەسەر بردووە، بە دەست هەژارییەوە نالاندوویەتی، بەڵام ئەمە ڕێگر نەبووە و هەر لە تەمەنێکی بچووکی منداڵییەوە تێکەڵ بە دونیای هونەر و شانۆ بووە. سووچێکی لە ژوورەکەی خۆیدا تەرخان کردووە بۆ نمایش، بوکەڵەیەکی دروست کردووە و هەموو ڕۆژ دواندوویەتی و شانۆیی پێ گێڕاوە. هاوکات زۆر بە تاسووقەوە چووە بۆ بینینی هەموو نمایشەکانی شانۆیی شکسپیر و سۆفۆکلیسی لە کۆپنهاگن. ئەندرسنیش وەک زۆربەی هەرە زۆری نووسەر و کەسایەتییە بەناوبانگەکانی دونیا، لە قوتابخانەدا شکستی هێناوە، ڕەفتار و هەڵسووکەوتەکانی سەیر بوون و لە لایەن قوتابییەکانی دیکەوە گاڵتەی پێ کراوە، کە چووەتە دەریش بە هۆی بالای درێژ و ناقۆلای و ئەوەشی کە دەیەویت ببێ بە ئەکتەر، خەڵکی داویانەتە بەر توانج و تەشەر و پێی پێکەنیون. زۆر ناخایەنێت ئەندرسن جیهانی شانۆ جێ دەهێڵێت و ڕوو دەکاتە چیرۆک و ڕۆمان و ئەفسانە. دەکرێ بڵێین کە ئەم گۆڕانکارییەش بەهۆی دایکییەوە بووە کە بەردوام بە زمانێکی شیرین و جوان توانیویەتی چیرۆکە ئەفسانەییەکان لە خەیاڵ و هزری منداڵێکی وادا بچەسپێنێت، تا وای لێهات کە ئەندرسن زیاتر بەو جیهانە ئەفسانەی و خەیاڵییە سەرسام بوو وەک لە جیهانی واقیعی خۆی.

ڕێگەی سەرکەوتن بۆ ئەندرسن هەروا ئاسان و بێکێشە نەبوو، وەک دەزانرێت هەموو نووسەر و بیرمەندێک بەشی خۆی نالاندوویەتی تاکوو ناوبانگێکی بۆ خۆی پەیدا کردووە. کاتێکیش لە ئەندرسنیان دەپرسی کە بارودۆخ و گوزەرانی

ژیانی چۆن بووە، وەڵامی دەدانەوە: «چیرۆکی مراوییە ناشرینەکە بخوێننەوە!» لەم چیرۆکەدا ئەندرسن ئەوەمان نیشان دەدات کە ڕێگەی سەرکەوتن هەروا ئاسان نییە، قوربانی و ماندووبوونی زۆری دەوێت. چیرۆکەکە باس لە مرراوییەک دەکات کە براکانی و ئاژەڵەکانی دیکە پەسەندی ناکەن و بە ناشرین لە قەڵەمی دەدەن، هەر بۆیە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەچێت، بۆ جێیەک یاخود ئاژەڵێک دەگەڕێت کە بەهای ئەم بزانێت و وەک خۆی ببینێت، تا دواجار دەردەکەوێت کە بەو جۆرەی باس دەکرا، مراوییەکی ناشرین نییە! زۆربەی زۆری ڕەخنەگرەکان دەڵێن کە هەموو نووسەر و مرۆڤێک، چیرۆکێکی چەشنی مراوییە ناشرینەکەی هەیە، لەم چیرۆکەشدا ئەندرسن داهێنەرانە، ئازار و نەهامەتییەکانی ژیانی خۆی باسکردووە.

ئەو کاتەی ئەندرسن هێشتا لە دانیمارک بوو، کەم کەم دژایەتی بیرۆکەکانی دەکرا، بەڵام لە ئەوروپا ناوبانگ و دەنگدانەوەیەکی باشی دروست کردبوو. لە ساڵی ١٨٤٧ سەردانی ئینگلتەرا دەکات و لەوێ چارلز دیکنز بانگێشتی ماڵی خۆیانی دەکا، تاکوو لەوێ دوو هەفتە بمێنێتەوە، بەڵام هانس لە بری دوو هەفتە شەش هەفتە دەمێنێتەوە، بێئاگا لە ئاماژە ناڕاستەوخۆکانی دیکنز کە دەیەوێت بڕوات. دواتر و پاش ئەوەی ئەندرسن دەڕوات، دیکنز ڕۆمانە بەناوبانگەکەی خۆی «دەیڤد کۆپەرفیڵد» بڵاو دەکاتەوە کە دەگوترێ کەسایەتیی ئۆریای لە ئەندرسنەوە وەرگرتووە. هەندێک لە کارەکانی هانس ئەندرسن ئەمانەن: «پەریی دەریا، مراوییە ناشرینەکە، شاژنی بەفر، سەمبێلینا، چیرۆکە ئەفسانییەکانی ئەندرسن، قازە

کێوییەکــان، پــێڵاوە ســوورەکان، چیرۆکــی دایکێــک، ســێبەر، باخچەکەی فیردەوس، چیرۆکی ساڵ، پیاوی بەفر... هتد.»

# پیرەمێرد کێیە؟



پیرەمێرد، ناوی (تۆفیق مەحمود هەمزە)یە، ئەم شاعیر و ڕۆژنامەنووسە مەزنە، لە ساڵی ١٨٦٧ی زاینی بەرامبەر بە ١٢٨٨ی کۆچی، لە شاری سلێمانی چاوی بە دنیا هەڵهێناوە، لەو ڕۆژەدا ماڵی مەحمودئاغای هەمزاغای مەسرەف، خۆشی

و بەشـــارەتێکی زۆری تــێکەوت، گۆزەبــانە دەبەخشــرایەوە، مزگێنــی ئەدرا و زەردەخەنە لەســەر لێــوی ئەو پیاومــاقوڵانە دەنەخشا، کە پیرۆزباییان لە مەحمود ئاغا دەکرد، چونکە خوا کــوڕێکی دابــوویە، لەبەرئەوەی بــاوکی مەحمــود ئاغــا، واتــا هەمزاغــای مەســرەف، ســـەرۆک وەزیــران و لێپرســـراوی کاروبـاری دارایـی ئەحمەد پاشـای دوامیری بابانییەکـان بـوو، لەبەرئەوە لەڕۆژی سیازدەیدا مەولودنامەیان خوێند و خواردن بــۆ هەژاران نێــردرا و بەرگ بــۆ منــداڵانی بێبــاوک کــردرا و مەلاش بانگی بە گوێی ئەم ساوایەدا دا و ناونرا (تۆفیق).

رۆژێــک (تۆفیــق)ی تەمەن هەشـــت نــۆ ســـاڵان، لەگەڵ مامۆستاکەیدا لەسـەر شـیعرێکی (حـافز)ی شـیرازی تێکـدەچن، چــونکە پیرەمێــرد خــۆی بە خــاوەن مــاف دەزانــێ، نایەوێــت لەقســـەی خـــۆی پاشـــگەز ببێـــتەوە و داوای لێبـــوردن لە مامۆســـتاکەی بکــات، ناچــار حەســـەن ئەفەنــدی مــامی لەو حـوجرەیە گواسـتییەوە و بـردی بـۆ حـوجرەی مەلا سـەعیدی زلزلەیـی. کە ئەیبـاتە ئەوێ، حەسـەن ئەفەندیی ئەڵـێ: (تۆفیـق ئومێد ئەکەم دەم و نەفەسـی ئەم زاتە پـاکە بتکـا بەشـاعیرێکی وەکوو من) بەمەدا دەردەکەوێت کە حەسەن ئەفەندی مامیشـی هەر شاعیر بووە، هەرچەندە بەداخەوە کە ئێمە هەتا ئێستا هیچ شـــیعرێکی ئەومـــان دەســـت نەکەوتـــووە. لەم حـــوجرەیەدا ســەرەتای بەهــرەی شــیعر وتنــی تێــدا دەرکەوت، خــووی دایە خوێنـدنەوەی ئەدەبیـات و شـیعر و سەرگوزشـتەی ئەدیبـان و شـاعیران، لەسـەر دابونەریتی کوردەواری و بەپێـی ئەوەی کە لە بنەمــاڵەیەکی عەشــایەردا چــاوی هەڵهێنــابوو، ئــارەزووی ســوارچاکی و تفەنگچێتــی پەیــداکرد. شــۆرەتی ســوارچاکیی

پیرەمێرد بەناوبانگ بوو، وەک مامۆستا سەجادی دەیگێڕێتەوە، لە شاخی هەڕووتە، کە پیادە بە ئاستەم پێیدا سەردەکەوێت، ئەم بەتاو لەسەردا ئەسپی هێناوەتە خوارەوە، بەسەر پردی قەشان و تەپادا بەغار پەڕیوەتەوە.

لەسەرەتاوە لەمزگەوتەکەی باپیری کە ئێستاش ماوە (مزگەوتی هەمزاغا)، کە نزیک ماڵی خۆیان بووە و لەنزیک باخێک بووە پێیان وتووە باخی پوورەبەگی، کە لەگەڕەکی گۆیژەیە و چاپخانەکەی پیرەمێرد لە نزیک ئەو مزگەوتەیە، لای مەلا مەحموود دەرسی عەرەبی دەخوێنێت، لە خوێندنی عەرەبیدا دەچێتە پێشەوە و دەست ئەکا بە خوێندنی (سوتی)، بە دوای خوێندندا وەک هەر فەقێیەکی ئەو سەردەمە لە شار و جێگەی خۆی دوور دەکەوێتەوە، بەپێی ئەو عادەتەی، کە لە کام مزگەوتدا مامۆستای چاک بووبێ فەقێکان ڕوویان تێکردووە، وەکو چۆن مامۆستایانی ئێستا هەریەکەی لە بوارێکدا شارەزایی پەیدا دەکەن و وانە دەڵێنەوە، مامۆستایانی ئەوساش هەر مەلایەی لە بوارێکی تایبەتدا شارەزایی پەیدا دەکرد، پیرەمێردیش هەروەکوو حاجی قادری کۆیی و نالی و مەحوی و مەولەوی و زێوەر، مزگەوتاومزگەوت و شاربەشار گەڕاوە و لە هەر شوێنێک ماوەیەک ماوەتەوە، جا گەیشتووەتە مزگەوتەکانی شاری (بانە) لە کوردستانی ئێران و ماوەیەک لەوێ ماوەتەوە و پاشان گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی. بەڵام پێش ئەوەی تەواوی بکات، دەستی لە خوێندن هەڵگرت و ڕووی کردە ژیانی ڕۆژانەی ئەم دنیایە. لەو سەردەمەشدا هەرکەسێک خوێندنی مەلایەتی تەواو بکردایە و مەلایەتی بکردایە، ئەوە دەبوو بە مەلا، بەڵام گەر وازی لێبهێنایە پێیان دەوت (میرزا)،

بەو پێـیەی پیرەمێـردیش وازی لەخوێنـدنەکەی هێنـا، بـوو بە میرزا.

لە ئەیلولی ساڵی ١٨٨٢ی زاینیدا، واتە لەتەمەنی (١٥)ساڵیدا، دەبێت بە کاتبنفووسـی سـلێمانی، زۆری پێناچێت دەکرێـت بە کاتبی (زەبت) لە دادگای سلێمانی، لە حوزەیرانی ساڵی ١٨٨٣دا بووە بە فەرمانبەری زەوی و زار و موڵکی میری لە هەڵەبـجە، نـزیکەی سـێ سـاڵ لەوێ مـاوەتەوە، بەپێـی نووسـینەکانی پیرەمێرد بێت کە لە (ژیـان) و (ژیـن) دا بڵاویکـردوونەتەوە، وا دەردەکەوێـت کە ئەو سـەردەمە عەشـقی شـیعر لەدەروونیـدا بووە، خولیای شیعر کۆکردنەوە کەوتۆتە سەری، تا ئەو دەمە هەر خەریکی لەبەرکردنی شیعری (نالی) بووە، بەڵام کە چۆتە ئەو نـاوچەیە، شـەیدای (مەولەوی) و (بێسـارانی)یش بـووە، بە هەمـوو دەشـتی شـارەزووردا گەڕاوە، کەشـکۆڵی ڕەنگینـی بـۆ خـۆی پـێکەوە نـاوە و هەرچـی شـیعرێکی دەسـکەوتبێت یـان بینیبێت یان بیستبێت، لە کەشکۆڵەکەیدا نووسیویەتیەوە، پاشان بوو بە سەرنووسەر (باشکاتب) لە دادگای چوارتـا، لە تشـرینی یەکەمـی سـاڵی ١٨٩٥دا گـوازرایەوە بـۆ (کەربەلا) بە وەزیـفەی مودەعی یاریدەدەریی گشتی، بەڵام بڕیاریدا کە نەچێت بۆ ئەو وەزیـفەیە و بە یەکجـاریی دەسـت لە فەرمـانبەریی دەوڵەت هەڵگرێت، شێخ موستەفای نەقیب دڵخۆشی دایەوە و کردیی بە نووسـەری تـایبەتی خـۆی بـۆ ڕاپەڕانـدنی ئیشـوکارەکانی و ژیانێکی باش و لەباری بۆ خوڵقاند.

# ژیانی لە تورکیا



لەبەرئەوەی (تۆفیق) لاوێکی زرنگ و زیرەک و بەڕەوشت بوو و خوێندەوارییەکەشی بەپێی ئەو سەردەمە باشبوو، لەتەک بنەماڵەی شێخانی سلێمانیدا پەیوەندییەکی پتەوی پەیداکرد، تا وایلێهات متمانەی زۆر شتیان پێکرد، خۆشیان دەویست، جێی بڕوایان بوو، بۆیە کاتێک لە ساڵی ١٨٩٨ شێخ

سەعیدی حەفید (باوکی شێخ مەحموودی نەمر) لەسەر بانگێشتی سوڵتان عبدولحەمید بانگکرا بۆ ئەستەنبووڵ، شێخ سەعید و شێخ مستەفای نەقیب ڕوویان لە تۆفیقی مەحموود ئاغا نا کە لەگەڵیان بچێت بۆ تورکیا، ئەمیش بەپێی ئەو نزیکی و پەیوەندییەی لەگەڵیاندا هەیبوو، دەستی نەنا بە ڕووی داواکەیانەوە، بەم جۆرە شێخ سەعید جگە لە شێخ مستەفای نەقیب، چەند کەسێکی هەڵبژارد لەگەڵیاندابن، یەکێکیان تۆفیقی مەحموود ئاغای هەمزاغای مەسرەف بوو.

تۆفیق لە خزمەت شێخ سەعید و شێخ مستەفای نەقیب و شێخ مەحموود و دەستە و دایەرەیانا گەیشتە ئەستەنبووڵ، لەوێش بوونە میوانی بارەگای سوڵتان، لە پاش ساڵێک لەگەڵ شێخ سەعید و شێخ مستەفا و گەلێ ڕۆشنبیر و پیاوانی بەناوبانگی سەفەرەکەیاندا دەچن بۆ (حەج)، تۆفیق دەبێت بە حاجی تۆفیق، کاتێک لە حەج دەبن وەفایی شاعیر و سەید ئەحمەدی خانەقای کەرکوک، دەبنە هاوڕێی حاجی تۆفیق.

بەم شێوەیە تۆفیقی مەحموود ئاغا، لە تەمەنی ٣٢ساڵید او لە هەڕەتی لاویدا، بوو بە حاجی تۆفیق. بەهۆی زیرەکی و هۆشیاریی خۆیەوە، حاجی تۆفیق زوو دەچووە دڵەوە، ئەمەیان لە لایەک، لە لایەکی تریشەوە لە نووسین و داڕشتنی فارسیدا دەستێکی باڵای هەبوو، لەبەرئەوە عزەت پاشای نووسەری دەرباری شەهریار لە ئەستەنبووڵ، بۆ وەڵامدانەوەی ئەو نامەیەی کە ناسرەدینی شای ئێران بۆ سوڵتان عەبدولحەمیدی ناردبوو، داوا لە حاجی تۆفیق دەکات بە فارسیی وەڵامی سوڵتان بۆ شای ئێران بنووسێتەوە، وەڵامەکە هێندە جوان دەبێت سەرنجی کاربەدەستانی دەرباری سوڵتان ڕادەکێشێت،

بۆ پاداشتی ئەمە، لە ١٤ئەیلولی ١٨٩٩ ئیرادەی سولتانی بۆ دەردەچێ. دەبێتە ئەندام لە ئەنجومەنی باڵادا لە ئەستەنبوول، هەروەها پلەی بەگێتیشی هەر لەو ماوەیەدا بەهۆی عزەت پاشاوە لە ئەستەنبوول، لە کۆلێجی یاسا (کلیە الحقوق) وەردەگیرێت و بڕوانامەی حقوق وەردەگرێت.

لە تەمووزی ١٩٠٥دا، بانگی مەشروتیەت درا و مەجالیسیان تێکچوو، هەر بۆیە حاجی تۆفیق هەتا ساڵی ١٩٠٨ لە ئەستەنبوول بە کاری پارێزگاری و گۆڤار و ڕۆژنامەوە خەریک بووە. لە ساڵی ١٩٠٧ (کۆمەڵەی کورد) بە نهێنی پێکهات، بە سەرۆکایەتی (شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ عەبدوڵلای شەمزینی) کە پیرەمێرد یەکێک بووە لە دامەزرێنەکانی ئەم کۆمەڵەیە. پاشان لەساڵی ١٩٠٨دا کە حیزبی (اتحاد و ترقی) کەمالیستییەکان سوڵتان عبدولحەمیدیان لابرد، ئەو کۆمەڵەیە بە ئاشکرا خۆی ناساند و پیرەمێردیش یەکێکبوو لە ئەندامەکانی.

ئینجا لە ١٩١٨/٤/١٧دا، کرا بە موتەسەڕیفی (ئەماسییە)، کە ئەمە دوا وەزیفەی بوو لە تورکیا(٢٤)، لەو کاتەدا خزمەکانی لە سلێمانییەوە دەست دەکەن بە نامەنووسین بۆی، بە تایبەتی موستەفا سائیبی خوشکەزای گەلێ نامەی بۆ ناردووە و داوای گەڕانەوەیان لێکردووە کە بێتەوە بۆ کوردستان.

پیرەمێرد ماوەی ٢٥ساڵا لە تورکیادا دەمێنێتەوە، پرسیارێک بەرەو ڕوومان بکرێت کە ئاخۆ بۆچی حاجی تۆفیق ئەمەندە ساڵە لە غەریبی مایەوە، بۆچی دوای گەڕانەوەی شێخ

سەعیدی حەفید لەگەڵیا نەهاتۆتەوە بۆ کوردستان و لەوێ مایەوە؟

لە وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارانەدا وتراوە:

١-ئەم ئەدیبە مەزنە لەبەرئەوەی لە قوتابخانەی ڕەسمیدا نەیخوێندووە و لە حوجرە و مزگەوتەکانیشدا وەک لەمەوبەر زانیمان لە (سویتی)دا وازیهێنابوو، لەبەرئەوە کە گەیشتە ئەو وڵاتە، بۆی دەرکەوت کە ئەم لەچاو ئەدیبی ئەوێدا نیوە خوێندەوارە، بۆیە پڕبەدڵ ئارەزووی لەوەبووە کە هەلێکی بۆ بڕەخسێ و بتوانێ بخوێنێ و ئاسۆی بیری فراوان بکات. ئەوەبوو ئاواتەکەی هێنایە دی، بەوەی توانی (حقوق) تەواو بکات و ببێتە پارێزەری ڕەسمی خاوەن بڕوانامەی باوەڕپێکراو، خۆی لەم ڕووەوە لە وەسیێتنامەکەیدا دەڵێ: (بە نیوە خوێندەواری لە سلێمانی دەرچووم و خوێندنێکی بەرزم هێنایەوە) هەروەها دان بەوەدا دەنێت کە زۆربەی ڕووناکبیرانمان سەرچاوەی ڕووناکبیرییان تورکیا بووە، کە وەک وتمان: ئەودەمە مەڵبەندی ڕووناکبیری بووە و کەڵچەری ڕۆژئاوا یەکەمجار گەیشتۆتە ئەوێ، ئەمجا بە وڵاتانی تردا پەخشیداوەتەوە، حەوت ساڵا بەرلەوەی ئەم جیهانە بەجێبێڵی وتویەتی: (ئێمە زۆرمان لەئێوەوە پێگەیشتووە).

ئەمانە سەلماندنی ئەوەن کە مەبەستی بووە ببێتە خوێندەوارێکی چاک و شارەزای هەموو جۆرە زانستێک بێ، دیارە ئەمانەش لەو دەمەدا بۆ کوردێکی وەک ئەو هەر لەوێ دەستگیر دەبوون.

٢-جگه له خوێندن وەک شاعیرێکی هەست ناسک، ئارەزووی له تێکەڵبوونی رووناکبیران بوو، جا که لەئەستەمبوڵا جێگیر بوو، هەستی بەوەکرد شەپۆلی تازەگەری و نوێخوازی لەبەرهەمە رەنگینەکانی ئەدیبانی سەردەمی بوژانەوەدا رەنگی داوەتەوە و تازەترین ئەدەبی ئەوروپایی لەوێ دەکرێت ب ەتورکی و له بەردەست خوێنەراندایە، هەتا رووناکبیرە عەرەبەکانیش رووریانکردە ئەوێ، بە گشتی سەرچاوەی خوێندنەوەیان لەوێوە پێدەگەیشت، جا که حاجی تۆفیقی خۆمان ئەم بوژانەوە و رووناکبیرییەی هەستپێکرد، زۆر پێی شادومان بوو، بە تایبەتی که بووە گوڵی کۆڕ و ئەنجومەنی ئەو ئەدیبە کوردیانەی که لەوێ بوون، سەرەرای ئەدیبە تورکەکانیش.

٣-پیرەکوردی ئەستەنبوڵ، جگە له هەوڵدانی بۆ خۆرووناکبیرکردن و تەواوکردنی خوێندنی زانستگە، هۆیەکی گشتگیریش هەبوو که وای لێبکات بمێنێتەوە، ئەویش ئەو سەرگەرمی و تێکۆشانەی بوو لەتەک هاورێیانی خەباتیا بۆ رزگارکردنی کوردستان.

لەم سێ خاڵەدا بۆمان دەردەکەوێ که چ هۆیەکی گرنگ هەبوون بۆ مانەوەی (پیرەمێرد) له تورکیا. ئەگینا هەموو کاتێک دڵی هەر بۆ خاک و نشتیمانەکەی لێیداوە و هەمیشە خەوی بە کوردستانەوە بینیوە.

حاجی تۆفیقێک که زۆربەی تافی گەنجێتی و هەرزەکاری له تورکیادا رابواردووە، لەوێ ژنێکی هەبوو، دوو منداڵی لێی هەبوو، پاش ئەم ماوە دووورودرێژە، ئاگری نیشتمانی دایک

هەڵیگرت، سۆزی خۆشەویستی کوردستان و بەسەرهاتەکانی خستییە جموجۆڵ و سەر سەودای گەڕانەوە، وەکو چۆن نالی شاعیر هەڵبەستە بەرزەکەی لە شامەوە ناردبوو بۆ سالم لە شاری سلێمانی بۆ ئەوەی حاڵ و ئەحواڵی شاری سلێمانی لێبپرسێت و بۆی بنووسێت ئایا ماوەی گەڕانەوەی هەیە بۆ کوردستان یاخود ئەبێ تا دواهەناسەی هەر ئاوارە و دەربەدەر بێت و لەوڵاتی بێگانەدا بژی، پیرەمێردیش بەو جۆرە دەستیکرد بە نامەنووسین و پرسیارکردن لە حاڵ و ئەحواڵی کوردستان، بەڵام ئەو ڕۆژانەی کە پیرەمێرد دەیویست بگەڕێتەوە بۆ کوردستان، جیاوازییەکی زۆری هەبوو لەگەڵ ئەو ڕۆژانەی نالی هەڵبەستە بەرزەکەی ناردبوو بۆ سالم، کاتی نالی و سالم ئەو کاتەبوو کە کوردستان لەژێر باڵی دەسەڵاتی ڕەشی عوسمانییەکاندا دەیناڵاند، بەڵام سەردەمی گەڕانەوەی پیرەمێرد، سەرەتای جوڵانەوەی هێزی نەتەوایەتی بوو، شێخ مەحموود ئاڵای شۆڕشگێری و داواکردنی مافی گەلەکەی هەڵکردبوو، پیرەمێرد لە پرسینی حاڵ و ئەحواڵی ئەو سەردەمەی کوردستان، ئەم چەند دێڕەی خوارەوەی بۆ یەکێک لەخزمەکانی لەشاری سلێمانی کە موستەفا صائیبی خوشکەزایەتی، ناردووە.

بەرهەمەکانی پیرەمێرد

١٩٣٥ دوانزە سوارەی مەریوان.

١٩٤٢ مەحمود ئاغای شیوەکەڵ.

١٩٤٧ گاڵتەو گەپ

١٩٣٦ داستانی مەمو زین

پەندەکانی پیرەمێرد کە بریتییە لە(٦٤٤٨) پەند.

١٩٤٢ کەمانچە ژەن، وەرگێڕان لەتورکیەوە.

١٩٣٥ دیوانی مەولەوی لەدووبەرگدا چاپکرد.

بە ناوی (ئەسڵ و ڕۆح) ئەسڵ بەرگی یەکەمی دیوانەکە بوو بەشێوەزاری هەورامی (ڕۆح) واتە (ڕۆحی مەولەوی) بەرگی دووەم بوو کە بریتی بوو لەو دەقە سۆرانییەی کە پیرەمێرد ئامادەی کردبوو.

ئەمە جگە لە ساغکردنەوەی دیوانەکانی (بێسارانی و وەلی دیوانە) و دیوانی (مەولانا خالیدی نەقشەبەندیش)ی بە ئەڵقە لە ڕۆژنامەی ژیندا بڵاوکردۆتەوە.

لە ڕۆژی ١٩٥٠/٦/١٩ لە شاری سلێمانی کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: کتێبی باخێک لە وشەوە لە نووسینی (خوالێخۆشبوو مستەفای ساڵح کەریم)

# کاکەی فەلاح کێیە؟



کاکەی فەلاح ناوی تەواوی حەمەی کوڕی حەمە ئەمینی کوڕی قادرە و لە ساڵی ١٩٢٨ لە قەزاری چوارتای سەر بە شاربازێری سلێمانی لە دایک بووە و هەر لە تەمەنی منداڵیدا حەزی لە نووسینی شیعر کردووە و لە پاڵ ئەو بەهرەیەشدا کاری ڕۆژنامەنووسیشی کردووە و لە ساڵی حەفتاکان ماوەی چوار ساڵ خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەی (ژین) بووە. توانیویەتی

جـــارێکی دیـــکه ئەو ڕۆژنـــامەیە بە چـــاپ بگەیەنێـــت و چاپخـانەیەکیش هەر بە نـاوی خـۆی دابنێـت و چەنـدین کتێبـی تێدا چاپ بکات، لە ساڵەکانی ١٩٤٥ و ١٩٤٦ یەکەم شـیعری بە نـاوی (نەورۆز) نووسیوە، کاکەی فەلاح لە ئەدەبیاتی منداڵاندا دەستێکی باڵای هەبووە، بۆیە ئەگەر بە وردی سـەیری دیـوانی (چرۆ) بکەی ئەوا بە ڕوونی ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێت، نازنـاوی (کـاکەی فەلاح) یـش مێـژووەکەی بـۆ سـاڵی (١٩٤٧) دەگەڕێـتەوە کاتێـک شـیعرێکی بـۆ فەلاح و چەوســـاوەکانی ناوچەی شارباژێر خوێندۆتەوە، ئیدی لەو ساوە ئەو نازنـاوەی بە باڵا بڕاوە، سـەرباری هەمـوو ئەوانەش مرۆڤێکی سیاسـی و خاوەن هەڵوێست بووە، هەر دوای کۆچی دوایشی بنەماڵەکەی لە سـاڵی ٢٠٠٤ جـارێکی دیـکە دیوانەکەیـان بە چـاپ گەیانـد، بەرهەمە چاپکراوەکـانی ئەو شــاعیرە کـۆچکردووە بـریتین لە دوو کۆمەڵەشیعری منداڵان بە نـاوی (چرۆ ١٩٦٦) و (سـروود ١٩٦٨) لەگەڵ شەپۆڵەکانی (دیـوانێکی هـۆنراوە ١٩٦٧) و کتێبـی (ئـودیبی پاشـا) سـاڵی ١٩٧٨ لە عەرەبیـیەوە وەری گێـڕاوەتە سـەر زمـانی کـوردی، هەروەهـا دیـوانەکەی خۆشـی لە سـاڵی ١٩٨٠ لە بەغـدا بە چـاپ گەیانـد کە پێشـــەکییەکەی لە لایەن دکتـۆر عیـزەدین مسـتەفا ڕەسـوڵ نووسـراوەتەوە، دواتـر لە سـاڵی ١٩٨٠ و ١٩٧٩ بەرگـی یەکەم و دووەمـی کـاروانی هۆنراوەی نوێی کوردی بە چاپ گەیاند و سـاڵی ١٩٨٣یش لە سلێمانی (چۆلەکەی پاسـاری) بە چـاپ گەیانـد، بـۆیە چەنـدین جـار ڕووبەڕووی گـرتن و دوورخسـتنەوە و ئەشـکەنجەدان بۆتەوە، بۆیە لەو یـادە پڕ لە سـۆیە هەزاران سـڵاو بـۆ گڵکـۆی کاکەی فەلاح دەنێرین.



هێشتا لە ئەستەنبووڵ بووم، ڕۆژێ ئەو
منداڵانەی ڕۆژمانە ئەفرۆشن، بە هەموو کۆڵاندا
ڕایان ئەکرد و ئەیانقیژاند (چیقدای چیقدی چاڵغیچی)،
فۆڕمەیەک کە هەشت لاپەڕە بوو لە ڕۆمانی سەرگوزەشتەی
چاڵغیچی، کە ئێمە تارژەنی پێ ئەڵێین دەرچووبوو و ئەیانفرۆشت.
یەکێکم کڕی، شەو خوێندمەوە و زۆر خۆش بوو، ئینجا دانیشتین
و بە کۆمەڵ خوێندمانەوە، ئەمەندە خۆش بوو لە دڵماندا بوو
بە گرێ ئاخۆ سبەینێ فۆڕمەکەی تری دەردەچێ؟ بەیانییەکەی
فۆڕمەکەی تری دەرچوو و کڕیمان، شەو هەموو کۆبووینەوە و
یەکێک ئەیخوێندەوە. ئەمەندە پێی پێکەنین هەر مەپرسە... ئەم
ڕۆمانە خۆش و بەنرخە، هیچ پەردە بیرونانەی تیا نییە و
سەراپا پێکەنینێکی لەسەرخۆ و ئادابە.

پیرەمێرد




له بڵاوكراوەكانی ناوەندی ڕۆشنبیری